# پێشەکی

وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان لیژنەیەکی هاوبەشی پێکهێنا بۆ پێداچوونەوەو پەرەپێدانی بەشەکانی ڕێزمان و ئەدەب و ڕەوانبێژی لە پەرتووکی زمان و ئەدەبی کوردی پۆلی دوانزەهەمی ئامادەیی، لیژنەکەمان دڵسۆزانە کارەکانی خۆی دەست پێکردو لە ماوەی دیاریکراودا کۆتایی پێهێناو ئەو ئەرکەی پێی سپێردرا بوو جێبەجێی کرد.

ئەم پەرتووکەی لەبەر دەستدایە بەری ئەو ڕەنجەیە، بۆیە داواکارین لە مامۆستا بەڕێزەکانی بابەتی زمان و ئەدەبی کوردی پۆلی دوانزەهەمی ئامادەیی کە بە وردی و بەپێی پلانێکی دارێژراو پەرتووکەکە بلێنەوەو قوتابییان و خوێندکارانیش لە بەهرەکانی خۆیان بێ بەش نەکەن و لەو شوێنانەی کە پێویستییان بە ڕاڤەکردن و ڕوونکردنەوەی زیاتر هەیە درێغی نەکەن و ئەسپی خۆیان لەم مەیدانەدا تاوبدەن.

هەروەها ئەوەشمان پێخۆشە بلێین کە لە بەشی ئەدەب و نموونەی ئەدەبدا ئەو بڕەی لەبەر دەکرێت دەستنیشانکراوەو دەبێ هەموو لایەك پابەند بن پێی بۆ ئەوەی لەسەرتاسەری قوتابخانەکانی هەرێمدا لەبەرکردنەکە وەکو یەك بێت.

لە دواییشدا داوا لە مامۆستایانی پسپۆڕو شارەزا لەبواری زمان و ئەدەبی کوردی دەکەین کە بەچاوی ڕەخنەگرێکی بنیاتنەرەوە سەیری ناوەڕۆکی پەرتووکەکە بکەن و لەهەر کوێیەکدا کەم و کوڕییەکیان بەرچاوکەوت، بەهۆی پەروەردەکانیانەوە ئاگاداری بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان لە وەزارەتی پەروەردە بکەن بۆ ئەوەی لە چاپەکانی داهاتوودا ڕاوبۆچوونەکانیان بەهەند هەڵبگیرێن.

خوای گەورە پشتیوانی هەمووان بێت.

لیژنە

٢٠١٠/١٢/٢٦

# بەشی ڕێزمان

## لیژنەی پێداچوونەوەی زانستی

د. فەرەیدوون عەبدول بەرزنجی

عبدالرحمن رشید أحمد

أحمد محمود محمد

محمد احمد محمد

سادق ئەحمەد ڕوستایی

فاروق نورالدین ئاغۆك

طه یاسین طه

تاڤگە فاتح کریم

د. مصطفی محمد زنگەنە

عطا حمەصالح امین

عبدالستار فتاح

ناظم حسن أحمد

محسن احمد کریم

هوشیار درویش نامق

سامان نوری عزیز

## کار بە پێی ناوەرۆك چوار شێوازی[1] هەیە

### ١- شێوازی ڕێژەی ڕاگەیاندن

١- کارەکەی تۆمان دواخست.

٢- هاوکار قەڵەمەکەی بەخشیوە.

٣- هەموو بۆ بینینی پێشانگاکە هاتبوون.

٤- کە ئەوان هاتن بۆ ماڵی ئێمە، براکەم دەرگاکەی بۆیە دەکرد.

٥- دۆخی ئافرەتی کورد خاسیەتەکانی گەلی کورد دەنوێنێت.

٦- خانووەکەتان نەفرۆشرا.

٧- ڕاسپاردەکە بە ئەوان جێبەجێ ناکرێت.

لەم ڕستانەی سەرەوەدا (دواخست، بەخشیوە، هاتبوو، هات، بۆیە دەکرد،دەنوێنێت، نەفرۆشرا، جێبەجێ ناکرێت) هەموویان واتاکانیان هەواڵێك رادەگەینن دەردەخەن لە دەمێکدا، لە هەموو ئەم ڕێژانەدا لەوە بە گومان نین، کە واتای کارەکە گەیشتووەتە ئەنجام، واتا ڕوویان داوە یان ڕوو دەدەن یان ڕوونادەن، ئەم جۆرە ڕێژانە کە بۆ چەمکی گەیاندنی هەواڵێك بەکاردەهێنرێن، شێوازی ڕێژەی ڕاگەیاندنی کارن.

ئەو ڕێژانەی (کار) کە لە شێوازی ڕاگەیاندندا بەکاردەهێنرێن ئەمانەن:

**یەکەم: ڕێژەی ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندن:**

ئەم ڕێژەیە لە چاوگەکان، بە لابردنی (ن) نوونی چاوگ لە چاوگەکە دروستدەکرێت، وەك کاری (دواخست)، کە لە ڕستەی یەکەمدا نیشاندراوە.

---

(١) شێواز / اسلوب

**دووەم: ڕێژەی ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندن:**

ڕێــژەی ڕابــردووی نزیکــی ڕاگەیانــدن لەگــەڵ نیشــانەی ڕابــردووی تــەواوی ڕاگەیانـدن (وە، ووە)[1] دروســت دەکرێـت، وەك کـاری (بەخشـیوە) کـە لـە ڕستەی دووەمدا نیشاندراوە.

**سێیەم: ڕێژەی ڕابردووی دووری ڕاگەیاندن:**

ڕێــژەی ڕابــردووی نزیکــی ڕاگەیانــدن لەگــەڵ نیشــانەی ڕابــردووی دووری ڕاگەیاندن (بوو) دروست دەکرێت.

وەك کاری (هاتبوو)، کە لە ڕستەی سێیەمدا نیشاندراوە.

**چوارەم: ڕێژەی ڕابردووی بەردەوامی ڕاگەیاندن:**

ڕێژەی ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندن، نیشـانەی (دە)ی دەخرێتـە بـەردەمی بـۆ دروستکردنی ڕێژەکە ئەگەر کارەکە سادە بوو،بەڵام لەکاری داڕژاو و لێکـدراو نیشانەی(دە) دەخرێتە دوای بەشی یەکەم ، وەك کاری (بۆیە دەکرد)، کە لە ڕستەی چوارەمدا نیشاندراوە.

---

(١) لە ڕێژەی ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندندا (ووە) بـۆ ئـەو کارانـە بـەکار دێـت کـە قـەدەکانیان کۆتایی بە پیتی (د، ت) هاتووە، نیشانەی (وە) بۆ قەدی ئـەو کارانـە بـەکاردێت کـە کۆتاییـان دێت بە بزوێنەکانی (ا ، ی ، وو).

## پێنجەم: ڕێژەی ڕانەبردووی ڕاگەیاندن:

ڕەگی کار، نیشانەی ڕێژەی ڕانەبردووی ڕاگەیاندن (دە)[1] دەخرێتە بەردەمی ڕەگی کارەکە ئەگەر سادە بێت بەڵام ئەگەر داڕێژراو بوو یان لێکدراو نیشانەی (دە) دەخرێتەدوای بەشی یەکەمی کار ئینجا جێناوە کەسییە لکاوەکان دەنووسرێن، کە ئەمانەن:

(م ، ین ، یت ، ن ، (ات ، ێت) ، ن).

دە + ڕەگی کار + جێناوی کەسیی لکاو وەك کاری (دەنوێنێت) کە لە ڕستەی پێنجەمدا نیشاندراوە.

هەروەها دەبێت ئاماژە بەوە بکرێت کە لە شێوازی ڕێژەی ڕاگەیاندندا:

١- کاری بکەر نادیار بەکار دەهێنرێت.

٢- لە ڕێژەی کاری ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندندا، ئەگەر کاری نزیکی ڕاگەیاندن کۆتایی بە پاشگری (ەوە) هاتبوو، ئەوا ناوبەندی (ت) دەخرێتە نێوان نیشانەی ڕابردووی تەواو و پاشگرەکەوە:

خوێندەوە ⟵ خوێند + ووە + ت + ەوە

دۆزییەوە ⟵ دۆزیـ + وە + ت + ەوە

٣- ڕێژەکانی شێوازی ڕاگەیاندن لە شێوەی (ئەرێ)وە دەکرێن بە نەرێ:

ئـ- هەموو ڕێژەکانی ڕابردووی ڕاگەیاندن بە کاری بکەر دیار و بکەر نادیارەوە بە ئامرازی (نە) نەرێ دەکرێت، وەك: بوو ⟵ نەبوو

فرۆشرا ⟵ نەفرۆشرا

وەرگرت ⟵ وەرنەگرت

---

(١) لە هەندێك دیالێکتی کوردی لەجیاتی نیشانەی (دە) نیشانەی (ئە) بەکاردێت.

ب- ڕێژەی ڕانەبردووی ڕاگەیاندن بە کاری بکەر دیار و نادیارەوە بە ئامرازی (نا) نەرێ دەکرێت، لە شوێنی نیشانەی (دە) دادەنرێت وەك:

دەبێت ⟵ نابێت

ئاوەدان دەکەنەوە ⟵ ئاوەدان ناکەنەوە

دەنووسرێ ⟵ نانووسرێ

**بەکورتی:**

**هەندێ ڕێژەی کار بۆ خەبەردان ڕاستەوخۆ لە کار و حاڵی کەسێك یان شتێك بەکاردەهێنرێت و گومان لەوەدانیە، کە کارەکە گەیشتووەتە ئەنجام یان نەگەیشتووە، بەم ڕێژانەی کار دەگوترێت (شێوازی ڕاگەیاندن).**

## ڕاهێنان (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا کارەکان دەربهێنە. بزانە سەر بە چ ڕێژەیەکن لە شێوازی ڕاگەیاندندا؟

١- باخەوانەکە باخەکە باش خزمەت دەکات.

٢- تە ناما من خواندبوو.

٣- ئەوان گەیشتنە هەولێر.

٤- دیوانەکانی چاپکردووە.

٥- کوردستان ئاوەدان کراوەتەوە.

٦- باخچەکەیان ئاو دەدا.

٧- لە سەیرانەکە بەجێما.

## ڕاهێنان (٢)

لەم چاوگانە (ڕامالین، خولانەوە، ئازادکردن)

ڕێژەی ڕابردووی تەواو، ڕێژەی ڕابردووی بەردەوامی ڕاگەیاندن دروست بکە:

## ڕاهێنان (٣)

ئەم کارانە بە شێوەی نەرێ لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

(خواست، دەرباز کردووە، جولایەوە ، نووسیبوو، دادەخات).

## ڕاهێنان (٤)

ئەم ڕستانە شیبکەوە:

١- شڤان ل بن کەپرێ نڤستییە[1].

٢- شاناز ڕایەخەکەی چنی.

٣- ڕاسپاردەکەیان بۆ ئەوان ناردبوو.

٤- گوندەکان ئاوەدان دەکرێنەوە.

## ڕاهێنان (٥)

لە ڕستەی (هۆنراوەکانیان لەبەرکرد، ئینجا چوون بۆ قوتابخانە)

١- **هەردوو کار لە چ ڕێژەیەکدان؟**

٢- لەکاری(لەبەرکرد) ڕێژەی رابردووی تەواوی ڕاگەیاندن دروست بکە و لەڕستەی تر بەکاری بهێنە.

٣- لەهەردوو کار ڕێژەی رابردووی بەردەوامی ڕاگەیاندن دروست بکەو ڕستەکە بنووسەوە.

٤- لەهەردوو کار، ڕێژەی ڕانەبردووی ڕاگەیاندن دروست بکە و ڕستەکە بنووسەوە.

٥- وشەی (هۆنراوەکان) شی بکەوە.

---

(١) لە شێوازی کرمانجی ژووروودا لەجیاتی نیشانەی (وە) نیشانەی (یە) لە ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندندا بەکاردێت، وەك: **هێناوە** ← **هێنایە** **چاندووە** ← **چاندییە**

* هەروەها لە هەندێ ناوچەی کرمانجی ژووروو بەم شێوەیەش درووست دەکرێت:

( یا + ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندن + ی ) وەك : یا هینا + ی = **یاهینای**

(یێ + ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندن + ی ) وەك: یێ + چاند + ی = **یێ چاندی**

## ٢- شێوازی ڕێژەی دانانی

ئ-

١- بریا بۆ ئاهەنگەکە چووبان.

٢- ڕەنگە لە ژوورەکەدا خەوتبێتن.

٣- کاشکی چوو بوو بام و گلەییم نەهێنابایە سەرخۆم.

ب-

١- بریا نانەکەت خواردبا.

٢- لەوانەیە خانووەکەیان کڕیبێت

٣- دەبوو بارەکەتان ئامادەکردبا پاشان چووبان بۆ هەولێر.

٤- خۆزگە کەپرەکەی دروستکردبووبا.

٥- خۆزی من خانییەك ئاڤا کربا.

پ-

١- دەبێت منداڵەکانمان جوان پەروەردە بکەین.

٢- دەمەوێت لە تاقیکردنەوەکاندا سەربکەویت.

ئەگەر بڕوانینە ئەو کارانەی کە لەو ڕستانەی سەرەوەدا هەن دەبینین، ڕێژەی ئەم کارانە وەك ڕێژەکانی کاری ڕاگەیاندن ڕاستەوخۆ ئەنجامی هەواڵێك کە دەدرێتە پاڵ کەسێك یان شتێك نادەن بە دەستەوە، بەڵکو لەشێوەی (گومان، مەبەست، ئارەزوو، ئاوات.....) ە.

لەگەڵ ڕێژەکانی شێوازی دانانیدا هەندێك کاری یاریدەدەر و هەندێك وشە بەکاردێن: (دەبێت، دەبوو، دەبووایە، بریا، خۆزگە، ڕەنگە ...) کە هەواڵەکە

دەدەن بەدەستەوە، گومان لە بە ئەنجام گەیاندنی کارەکە هەیە. لەکاتی گۆڕینی ڕستەی دانانی (ئینشائی) بۆ شێوازی ڕاگەیاندن (ئیخباری) یان داخوازی ئەم کار و وشانە لادەبرێن و پێچەوانەش ڕاستە.

١- ئەگەر کاری ڕستەکانی بەشی (ئـ) وەربگرین، کە ئەمانەن (چووبان، خەوتبێتن، چووبووبام) هەموویان تێنەپەڕن، لەبەر ئەوە جێناوە لکاوەکانی بکەر چوونەتە کۆتایی کارەکە.

٢- ئەگەر کاری ڕستەکانی بەشی (ب) وەربگرین، کە ئەمانەن (خواردبا، کڕیبێت، ئامادە کردبا، دروستکردبووبا، ئاڤاکربا) هەموویان تێپەڕن، لەبەر ئەوە جێناوی لکاوی بکەر دەکەوێتە دوای (بەرکار) لە کرمانجی ژووروو نەبێت کە جێناوی لکاو بەکارنایەت تەنیا هەر جێناوی کەسی سەربەخۆ بەکاردەهێنین وەکو لە نموونەی (٥) ی لقی (ب)دا.

٣- ئەگەر کارەکانی بەشی (پـ) وەربگرین، کە ئەمانەن (پەروەردە بکەین، سەربکەویت) کە بۆ دەمی ڕانەبردوو بەکارهاتوون، لەبەر ئەوە جێناوە لکاوەکانی بکەر چوونەتە کۆتایی کارەکە.

**دروستکردنی ڕێژەکانی شێوازی دانانی بەم شێوانەی لای خوارەوە دەبێت:**

ئـ- ڕێژەی ڕابردووی نزیکی دانانی:

ڕێژەی ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندن[1] + با

کەوتبا هێنابا وەرگرتبا ئامادەکردبا

ب- ڕێژەی ڕابردووی تەواوی دانانی:

ڕێژەی ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندن + بێت.

کەوت + بێت = کەوتبێت.

هێنا + بێت = هێنابێت.

هەڵبژارد + بێت = هەڵبژاردبێت.

یارمەتی دا + بێت = یارمەتی دابێت.

پ- ڕێژەی ڕابردووی دووری دانانی:

ڕێژەی ڕابردووی دووری ڕاگەیاندن + با

هێنابووبا . کەوتبووبا- وەرگرتبووبا - ئامادەکردبووبا...

ت- ڕێژەی ڕانەبردووی دانانی:

بـ + ڕەگی کار + جێناوی کەسی لکاو

بنووسم ـ بچێت ـ بخۆین ـ پەروەردە بکەین ـ سەربکەویت[2].

لێرەدا ئاماژە بەوە دەکەین کە (با، بێت، بووبا، ب) نیشانەن لە شێوازی دانانیدا، هەروەها هەموو ڕێژەکانی شێوازی دانانی بە ئامرازی (نە) نەرێ دەکرێت ئەگەر کارەکە لە دەمی ڕابردوو بوو، دەکەوێتە پێش کارەکە.

---

(١) ڕێژەی ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندن = قەدی چاووگ

(٢) ئەگەر کارەکە داڕێـژراو بـوو یـان لێکـدراو بـوو نیشـانەی (ب) دەچێتە دوای بەشـی یەکەمی کارەکە. هەروەها دەگونجێت دەرنەکەوێت.

بەڵام ئەگەر لە دەمی ڕانەبردووی دانانی بوو، ئامرازی (نە) شوێنی نیشانەی (ب) دەگرێتەوە. وەکو:

هاتبا ـــــــ نەهاتبا

هێنابێت ـــــــ نەهێنابێت

هێنابووبا ـــــــ نەهێنابووبا

بنووسم ـــــــ نەنووسم

## بەکورتی:

**ئەو ڕێژەیەی کارەکە ڕاستەوخۆ ئەنجامی ئەو هەواڵەی کە دەیداتە پاڵ کەسێك یان شتێك نایدات بە دەستەوە، بەڵکو لەشێوەی گومان، ئارەزوو، ئاوات، یان مەبەستدا. واتاکەی دەردەکەوێت.**

*** لە کارە تێپەڕەکان ، شێوازی ڕێژەی دانانی، کارەکان لە شێوەی (کاری بکەری نادیار)یش دروست دەبێت، بۆ نموونە:**

**خۆزگە نامەکە نوسرابا.**

**ڕەنگە نامەکە بنوسرێت.**

## ڕاهێنان(١)

ڕێژە و شێوازی کارەکانی ئەم ڕستانە دیاربخە؟

١– سا خوایە هەڵبکەی کزەی شەماڵێ

هەرای زەنگی غەم لە دڵ بماڵـــێ.

٢– کاشکی دیتبام و کتێبەکەم لێ وەرگرتبا.

٣– ئەگەر چووباین، پێیان دەزانی.

٤– ڕەنگە زوو هاتبێتن و زوو ڕۆیشتبێتن.

٥– ئەگەر بچێتە سەر سیروان وشکی دەکات.

٦– بریا کوردستان زیاتر پێشکەوتبا.

## ڕاهێنان(٢)

لە ڕستەی (دەبێت ژینگە بپارێزین).

١– (دەبێت) چ جۆرە کارێکە ؟ چی دەگەیەنێت؟

٢– (بپارێزین) لە چ جۆرە ڕێژەیەکدایە؟ چۆن دروستکراوە؟

٣– لەکاری(بپارێزین) ڕێژەی رابردووی نزیکی دانانی دروستبکە؟

٤– کاری(بپارێزین) بدە پاڵ جێناوە لکاوەکانی دووەمی تاك و سێ یەمی کۆ.

٥– شێوازی ڕستەکە بگۆڕە بۆ شێوازی راگەیاندن.

## ڕاهێنان (٣)

ئەم کارانە سەر بە چ ڕێژەیەکن لە شێوازی دانانیدا:

(نەپاراستبا، هاتبا، گەیاندبووبا، ئاگادار کردبێتەوە، بخوازێت).

## ڕاهێنان (٤)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شیبکەوە:

١– خۆزگە باران بارییا.

٢– دەبێت کورد پێش بکەوێت.

# ڕێژەی کـار

ئـ-

| | | | |
|---|---|---|---|
| کەوتم | کەوتوومە | دەکەوتم | کەوتبووم |
| کەوتین | کەوتووینە | دەکەوتین | کەوتبووین |
| کەوتیت | کەوتوویتە | دەکەوتیت | کەوتبوویت |
| کەوتن | کەوتوونە | دەکەوتن | کەوتبوون |
| کەوت | کەوتووە | دەکەوت | کەوتبوو |
| کەوتن | کەوتوونە(١) | دەکەوتن | کەوتبوون |

ب-

| (١) | (٢) | (٣) | (٤) |
|---|---|---|---|
| خوێندم | خوێندوومە | دەم خوێند | خوێندبووم |
| خوێندمان | خوێندوومانە | دەمان خوێند | خوێندبوومان |
| خوێندت | خوێندووتە | دەت خوێند | خوێندبووت |
| خوێندتان | خوێندووتانە | دەتان خوێند | خوێندبووتان |
| خوێندی | خوێندوویە (یەتی) | دەی خوێند | خوێندبووی |
| خوێندیان | خوێندوویانە | دەیان خوێند | خوێندبوویان |

(١) هەندێ جار لە شێوەزاری سلێمانی لەکاتی ئاخافتندا دەوترێت (کەوتووم - کەوتووین) (کەوتوویت، کەوتوون) (کەوتووە- کەوتوون)ە.

پ–

| | |
|---|---|
| دەچم | دەخۆم[1] |
| دەچین | دەخۆین |
| دەچیت | دەخۆیت |
| دەچن | دەخۆن |
| دەچێت | دەخوات |
| دەچن | دەخۆن |

ئەگەر بڕوانینە ئەو وشانەی سەرەوە، لە شێوە[2] و ناوەڕۆکیان[3] بکۆڵینەوە دەبینین:

---

(١) لە کرمانجی ژووروودا نیشانەی (دە) یان دەبێ بە (د) بۆ کاتی ئێستا یان (دێ) بۆ کاتی داهاتوو وەك دچم، دێ چم.

(٢) شێوە: شکل

(٣) ناوەڕۆك: محتوی.

١- هەموویان کارن و کارێك نیشاندەدەن، کارەکە بەردەمێك لە دەمەکان کەوتووە (ڕابردوو یان ڕانەبردووە) دراوەتە پاڵ کەسێك، کەسەکە تاك یان کۆیە لە دەوری بکەردا.

٢- ئەو کارانە لە شێوەدا لەیەك جیان و هەر یەکەیان واتایەك دەبەخشێت.

٣- ئەو دەم و کەسانەی، کە لەگەردان کردندا دراونەتە پاڵ هەر یەکێکیان بووەتە هۆی گۆڕینی شێوەیان، بۆیە بە هەر یەکێك لەو شێوانە دەگوترێت (ڕێژەی کار)[١] .

ئ- کاری ڕابردووی تێنەپەڕ، بە هاوکاری کۆمەڵە جێناوی لکاوی (م ، ین - یت، ن - Ø ، ن) دەبێت.

---

(١) ڕێژە: صیغة: مەبەست لە ڕێژە گەردانکردنی کارە (تصریف الفعل).

ئەگەر کار ڕابردووی تێنەپەڕ بوو، ئەوا جێناوە لکاوەکان لە کۆتایی داڕشتنی کارەکەدا دەبن، لە هەموو دەمەکانی ڕابردوودا جگە لە ڕابردووی تەواو نەبێت وەك: لە نموونەکانی بەشی (ئـ) نیشاندراون.

ب- کاری ڕابردووی تێپەڕ بـە هاوکـاری کۆمەڵـە جێنـاوی لکـاوی (م. مـان ـ ت. تان ـ ی. یان) دەبێت[1].

١- ئەگەر کار لە دەمـی ڕابـردووی نزیکـی ڕاگەیاندنـدا بـوو[2]، ئـەوا جێنـاوە لکاوەکان لەکۆتایی داڕشتنی کارەکەدا دەبن، وەك لە نموونـەکانی بەشـی (ب) ڕیزی (١) نیشاندراون.

٢- ئەگەر کـار لـە دەمـی ڕابـردووی تـەواوی ڕاگەیاندنـدا بـوو، ئـەوا جێنـاوە لکاوەکان، نیشانەی ڕابردووی تەواو (وە) کەرت دەکـەن و دەچـنە نێـوان نیشـانەی ڕابـردووی تـەواوەوە، وەك لـە نموونـەکانی بەشـی (ب) ریـزی (٢)نیشاندراون.

---

(١) ئەم جێناوە لکاوانە (مان، تان، یان) بەم شێوانە دروستکراون

مان = (م+ ان).

تان = (ت+ ان).

یان = (ی+ ان).

(٢) ئەگەر کار پاشگری (ەوە)ی پێوەبوو، ئـەوا جێنـاوی لکـاوی ڕیـژەی کـار، دەچـێتە پـێش پاشگرەکە.

٣- ئەگەر کار لە دەمی ڕابردووی بەردەوامی ڕاگەیاندندا بوو، ئەوا جێناوە لکاوەکان دەچنە دوای نیشانەی (دە)ی ڕابردووی بەردەوامەوە، وەك لە نموونەکانی بەشی (ب) ڕیزی(٣) نیشاندراون.

٤- ئەگەر کار لە دەمی ڕابردووی دووری ڕاگەیاندندا بوو، ئەوا جێناوە لکاوەکان دەچنە دوای نیشانەی (بوو)ی ڕابردووی دوور، وەك لە نموونەکانی بەشی (ب) ڕیزی (٤) نیشاندراون.

پ- ڕێژەی کار لە کاری ڕانەبردوو ( ڕاگەیاندن، دانانی ) بەهۆی جێناوی لکاوی کۆمەڵەی(٣) دێتەدی، کاری ڕانەبردووی (تێپەڕ و تێنەپەڕ) بە هاوکاری کۆمەڵە جێناوی لکاوی (م . ین ـ یت . ن ـ (ات – ێت). ن) دەبێت.

ئەگەر کارەکە ڕانەبردووی (تێپەڕ و تێنەپەڕ) بوو، ئەوا جێناوە لکاوەکان دەچنە کۆتایی ڕەگی کارەکە وەك لە نموونەکانی بەشی (جـ) نیشاندراون.

## تێبینی:

**ئەگەر کارە ڕابردووە تێپەڕەکە سادە بوو، لەشێوەی نەرێدا بوو، لە هەموو دەمەکانی ڕابردوودا، جێناوە لکاوەکان دەچنە دوای ئامرازی (نەرێ)، بەلام ئەگەر داڕێژراو یان لێکدراو بوو، جێناوە لکاوەکان دەچنە دوای بەشی یەکەمی کارەکە.**

| کەس | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | ناردم | ناردمان |
| دووەم | ناردت | ناردتان |
| سێیەم | ناردی | ناردیان |

| کەس | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | خەوتم | خەوتین |
| دووەم | خەوتیت | خەوتن |
| سێیەم | خەوت | خەوتن |

| کەس | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | دەچم | دەچین |
| دووەم | دەچیت | دەچن |
| سێیەم | دەچێت | دەچن |

| کەس | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | دەنووسم | دەنووسین |
| دووەم | دەنووسیت | دەنووسن |
| سێیەم | دەنووسێت | دەنووسن |

---

* لە کرمانجی ژووروودا لەجیاتی جێناوی لکاوەکانی (م، ت، ی، مان ... هتد) لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕدا جێناوەکەسیە جوداکانی(من، تە، ( وی، وێ ) ، مە، وە، وان) بەکاردەهێنرێت. وەك من چاند، وی چاند ... هتد.

| کەس | تاک | کۆ |
|---|---|---|
| ١ | وەردەگرم | وەردەگرین |
| ٢ | وەردەگریت | وەردەگرن |
| ٣ | وەردەگرێت | وەردەگرن |
| ١ | بانگ دەکەم | بانگ دەکەین |
| ٢ | بانگ دەکەیت | بانگ دەکەن |
| ٣ | بانگ دەکات | بانگ دەکەن |

**بەکورتی:**

**پێویستە بوترێ (ڕێژەی کار) ئەو شێوەیەیە کە کار بە پێی دەم و کەس و ژمارەی کەس لە گەردان کردندا دەردەکەوێت، کاریش شەش ڕێژەی هەیە.**

## ڕاهێنان(١)

کار بەپێی دەم و کەس چەند ڕێژە وەردەگرێت؟

لەم کارانەدا (بەست ، چووبا) نیشانی بدە؟

## ڕاهێنان (٢)

١- لە چ کاتێکدا جێناوی کەسیی لکاوی ڕێژەی کار دەکەوێتە نێوان ئەم نیشانەیە (وە)؟ بە نموونەوە ڕوونی بکەرەوە.

٢- ئەم جێناوە لکاوانە (م ــ ین، یت ــ ن، (ات — ێت).ن) چ کاتێك بەکاردێن بۆ ڕێژەی کار؟ بە نموونەوە ڕوونی بکەوە.

## ڕاهێنان (٣)

١- جێناوی کەسیی لکاوی ڕێژەی کار بەپێی کەس و ژمارە دەکەوێتە چ شوێنێکی ئەو کارانە (دەڕشت، دەهات)، بۆچی؟

٢- کاتێك کاری تێپەڕ بەکار هات، جێناوی لکاوی ڕێژەی کار دەچێتە کۆتایی بەشی یەکەمی کارەکە، ئەمە لە چ دەمێکی کاری ڕابردوو داهەیە؟ ڕوونی بکەوە.

٣- ئایا دەگونجێت جێناوی لکاوی ڕێژەی کار بچێتە دوای ئامرازی نەرێ؟ کەی ئەوە دەبێت؟ بە نموونەوە ڕوونی بکەوە.

## ڕاهێنان (٤)

لەم کارانەی خوارەوەدا ڕێژەی ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندن و دانانی دروستبکە، ئینجا بیاندە پاڵ جێناوە کەسییە لکاوەکان

(چاپکردەوە، پێداچووەوە).

## ٣- شێوازی ڕێژەی داخوازی

/١

| (ب) | (ئـ) |
| --- | --- |
| لێکۆڵینەوەکە مەنووسە. | لێکۆڵینەوەکە بنووسە. |
| کتێبەکە هەڵمەگرە. | کتێبەکە هەڵبگرە. |
| لەگەڵ فرۆشیارەکە ڕێك مەکەوە. | لەگەڵ فرۆشیارەکە ڕێك بکەوە. |

/٢

| | |
| --- | --- |
| گۆڤارەکە مەکڕن. | گۆڤارەکە بکڕن. |
| لە ژوورەوە دامەنیشن. | لە ژوورەوە دابنیشن. |
| شانۆگەرییەکە پێشکەش مەکەن. | شانۆگەرییەکە پێشکەش بکەن. |

/٣

| | |
| --- | --- |
| نانەکەت مەخۆ. | نانەکەت بخۆ. |
| پێنووسەکەت دامەنێ. | پێنووسەکەت دابنێ . |
| منداڵەکە بانگ مەکە. | منداڵەکە بانگ بکە. |

ڕێـژەی داخـوازی، فـەرمان و داوا و وریاکردنەوەیـە بـۆ بـەجێهێنان یـان بەجێنەهێنانی کارێك، لە لایەن کەسی دووەمی تاك، یان کەسی دووەمی کۆ. ئەم ڕێژەیە نیشانە و پێکهاتنی تایبەتی خۆی هەیـە، کەرەسـتەی پێکهـاتنی بریتیـە لـە، ڕەگـی کـاتی ڕانـەبردووی کـار و نیشـانەی (بـ) لـە پێشـییەوە و جێناوی کەسی لکاو لەدوایەوە دەبێت، (ە) بۆ کەسی دووەمی تـاك و (ن) بـۆ کەسی دووەمی کۆ بەکاردێت.

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕێژەی ئەو کارانەی لە ڕیزی ژمارە (١) بەشی (ئـ) نیشان دراون (بنووسە ــ هەڵبگرە ــ ڕێك بكەوە) دەبینین داوا لە كەسی دووەمی تاك دەكرێت، كە كارێك بە ئەنجام بگەیەنێت، بەڵام لە ڕستەكانی بەشی (ب) (مەنووسە ــ هەڵمەگرە ــ ڕێك مەكەوە) داوا لە كەسی دووەمی تاك بكرێت بۆ نەكردنی كارێك كە بەهۆی نیشانەی (مە)ەوە نەرێ كراوە.

هەروەها ئەگەر سەرنج بدەینە ڕێژەی ئەو كارانەی كە لە ڕیزی ژمارە (٢) بەشی (ئـ) نیشان دراون، كە بریتین لە (بكڕن ــ دابنیشن ــ پێشكەش بكەن) داوا لە كەسی دووەمی كۆ دەكرێت بۆ كردنی كارێك، هەروەها ڕستەكانی بەشی (ب) (مەكڕن ــ دامەنیشن ــ پێشكەش مەكەن) داوا لە كەسی دووەمی كۆ دەكرێت بۆ نەكردنی كارێك، كە بەهۆی نیشانەی (مە) نەرێ كراوە.

هەروەها ئەو كارانەی ڕەگی كاریان كۆتایی بە پیتی (نەبزوێن) هاتووە، ئەوا لە ڕێژەی داخوازیدا بەئاسانی جێناوی كەسی لكاو (ە) یان (ن) وەردەگرێت وەكو لە ڕستەكانی ژمارە (١، ٢) نیشان دراون، بەڵام ئەگەر ڕەگی كارەكە كۆتایی بە پیتی (بزوێن) هاتبوو ئەوا جێناوی لكاوی (ە)ی كەسی دووەمی تاك دەرناكەوێت، چونكە لە زمانی كوردیدا دوو بزوێن بەدوای یەكدا نایەن، بەڵام جێناوی لكاوی كەسی دووەمی كۆ دەردەكەوێت، وەكو لە ڕستەكانی ڕیزی ژمارە(٣)دا لەباری (ئەرێ و نەرێ)دا نیشان دراون.

* كاری (هات) ڕەگەكەی (هێ)یە، بۆ سووك كردنیش هەندێ جار دەبێتە (ێ) كارە داخوازییەكەش دەبێتە (بێ ، بێن) ، لێرەدا (ە) دەرناكەوێت لە كەسی دووەمی تاكدا بەڵام ئەم كارە شێوەی تری هەیە، وەك (وەرە – وەرن) تەنیا جێناوەكان بەپێی دەستوورە گشتییەكەی داخوازین دەنا نە (وەر) ڕەگی (هاتن)ە، نە (بـ) دەركەوتووە.

شایانی باسە ئەگەر کارەکە لەرووی دارشتنەوە (دارێژراو) یان (لێکدراو) بێت، لەکاتی ئاخاوتن و وتندا بەزۆری (بـ) دەرناکەوێت، بەڵام چاکتر وایە لەکاتی نووسیندا بنووسرێت، وەك:

وەربگرە – وەرگرە.

سەربخە – سەرخە.

فریابکەوە – فریاکەوە

**بەکورتی:**

**ڕێژەی داخوازی، ئەو ڕێژەیەیە کە قسەکەر بەشێوەی داوا و فەرمان، داوا لە کەسی دووەمی تاك، یان دووەمی کۆ دەکات بۆ بەجێهێنان یان بەجێ نەهێنانی کارێك.**

**بۆ دارشتنی کاری داخوازی، ڕەگی کاری ڕانەبردوو وەردەگیرێ و نیشانەی (بـ) لە پێشییەوە دادەنرێت و جێناوی کەسی لکاو (ە) بۆ کەسی دووەمی تاك و (ن) بۆ کەسی دووەمی کۆ لە دواوە پێوە دەلکێنرێت.[1]**

**بـ + ڕەگی کار +**
**ە: جێناوی لکاوە بۆ کەسی دووەمی تاك**
**ن: جێناوی لکاوە بۆ کەسی دووەمی کۆ.**

| ڕانەبردوو | ڕەگ | ڕێژەی داخوازی |
|---|---|---|
| **دەفرۆشێت** | **فرۆش** | **بفرۆشە، بفرۆشن** |
| **دادەگرم** | **داگر** | **دابگرە، دابگرن** |

(1) ئـ– کار هەیە لە دەستوور لادەدات بەتایبەتی کە دەدرێتە پاڵ کەسی دووەمی تاك وەك (بچۆ) (وەرە) (هەڕە) ئەگەر کارەکە کۆتایی بە پاشگری (ەوە) هاتبوو، ئەوا لە ڕێژەی داخوازیدا لەپاڵ کەسی دووەمی تاك پیتی (ر) دەکەوێتە نێوانیانەوە، وەك (بخوێنەرەوە، بهێنەرەوە ...)

ب– ئەگەر کۆتایی ڕەگی کارەکە پیتێکی (بزوێن) بوو، ئەوا دیسان پیتی (ر) دەکەوێتە نێوان کۆتایی ڕەگی کارەکە و پاشگرەکەوە، وەك (بکەرەوە ، بخۆرەوە ......)

پ– جێناوی لکاوی (ە–ن) لەکاری داخوازی (تێپەڕ – تێنەپەڕ) ی (سادە – دارڕژاو – لێکدراو) دەبن بە بکەر و دەچنە کۆتایی رەگی کارەکە.

## ڕاهێنان (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا ئەو کارانەی کە بۆ شێوازی داخوازی بەکارهاتوون دەریان بهێنە:

١- دڵسۆزی گەلی کورد ببە.

٢- پەرلەمانی کوردستان بپارێزن.

٣- لە هەموو هەورێك باران نابارێت.

٤- وەك هەنگ بگەڕێ گۆرانی بڵێ

لادە جار جارێ بۆ بەرپێی گوڵێ.

٥- وێنەکە مەشێوێنە.

## ڕاهێنان (٢)

لەرێژەی داخوازیدا (ە) چییە؟ کەی دەردەکەوێت؟

کەی دەرناکەوێت، وەڵامەکانت بە نموونەوە بسەلمێنە.

## ڕاهێنان (٣)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شیبکەوە:

١- گۆڤارەکان چاپ بکەن.

٢- پەخشانەکە بخوێنەرەوە.

٣- بەخۆشی بژی.

## ڕاهێنان (٤)

لە ڕستەی (پرۆژەکە تەواوبکە).

١- کوا بکەری ئەم ڕستەیە؟

٢- ئایا دەتوانیت نیشانەی (ب) لەکارەکە بەکارنەهێنیت؟ چۆن؟

٣- وشەی (پرۆژەکە) شیبکەوە.

٤- شێوازی ڕستەکە بکە بە شێوازی دانانی.

## ٤- شێوازی مەرجی

### ( ڕستەی ئاوێتەی مەرج )

١- ئەگەر یەکبگرین، سەردەکەوین.

٢- هەتا ڕەنج نەکێشیت، گەنج نانۆشیت.

٣- تا نیڤا دەستی ڕەش نەبیت، تاما دەڤی خۆش نابیت.

٤- کە ڕاپەڕین بەرپابوو، بەئامانج گەیشتین.

٥- کەی بایەخ بە پیشەسازی بدرێت، وڵات پێش دەکەوێت.

٦- ئەگەر نەورۆز هات، ئەم دێ چینە سەیرانێ.

٧- کەی چوویت بۆ پەڕتووکخانە، گۆڤارەکە ببەوە.

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو ڕستانەی سەرەوە و چاوێك بە ڕێژەی کارەکان بخشێنین، کە تیایاندا بەکارهێنراون، دەبینین هەر ئەو کارانەن کە لە شێوازی ڕاگەیاندن یا دانانی یا داخوازی بەکارهێنراون، بەڵام مەبەست لەم ڕستانەدا گۆڕاوە، واتە کارەکان بۆ مەبەستی بنجی خۆیان کە (ڕاگەیاندن، دانانی، داخوازی)یە بەکارنەهێنراون، بەڵکو بۆ مەبەستی مەرج بەکار هێنراون.

ئینجا ئەگەر سەیری ڕستەکان بکەین، دەبینین. لە ڕستەی یەکەمدا کاری (یەك بگرن) ڕێژەکەی ڕانەبردووی دانانییە، کاری (سەردەکەوین) ڕێژەکەی ڕانەبردووی ڕاگەیاندنە ئەمە لەڕووی ڕێژەوە، بەڵام لەڕووی ناوەرۆکەوە هەردووکیان لەم شوێنەیاندا بۆ مەبەستی مەرج بەکارهێنراون.

واتە ڕوودانی کاری (یەك بگرین) مەرجە بۆ ڕوودانی کاری (سەردەکەوین).

لە ڕستەی دووەمدا کاری (ڕەنج نەکێشیت) ڕێژەکەی ڕانەبردووی دانانییە، کاری (گەنج نانۆشیت) ڕێژەکەی ڕانەبردووی ڕاگەیاندنە، ئەمە لەڕووی ڕێژەوە بەڵام لەڕووی ناوەرۆکەوە هەردووکیان لەم شوێنەیاندا بۆ مەبەستی

مەرج بەکارهێنراون. واتە ڕوودانی کاری ڕەنج نەکێشیت مەرجە بۆ ڕوودانی کاری گەنج نانۆشێت.

لە ڕستەی سێیەمدا کاری (ڕەش نەبیت) ڕێژەکەی ڕانەبردووی دانانییە، کاری (خۆش نابیت) ڕێژەکەی ڕانەبردووی ڕاگەیاندنە ئەمە لەڕووی ڕێژەوە بەڵام لەڕووی ناوەڕۆکەوە هەردووکیان لەم شوێنەیاندا بۆ مەبەستی مەرج بەکارهێنراون.

واتە ڕوودانی کاری (نەبێت) مەرجە بۆ ڕوودانی کاری (نابێت) بۆیە بەم شێوانەی ڕێژەی کار لە بەکارهێناندا دەگوترێ شێوازی مەرج.

لە ڕستەی چوارەمدا کاری (بەڕیابوو) ڕێژەکەی ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندنە، کاری (گەیشت) ڕێژەکەی ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندنە ئەمە لەڕووی ڕێژەوە بەڵام لەڕووی ناوەڕۆکەوە هەردووکیان لەم شوێنەیاندا بۆ مەبەستی مەرج بەکارهێنراون، بۆیە بەم شێوانەی ڕێژەی کار لە بەکارهێناندا دەگوترێ شێوازی مەرج.

لە ڕستەی پێنجەمدا کاری (بایەخ بدرێت) ڕێژەکەی ڕانەبردووی دانانیيە، کاری (پێشدەکەوێت) ڕێژەکەی ڕانەبردووی ڕاگەیاندنە ئەمە لە ڕووی ڕێژەوە بەڵام لەڕووی ناوەڕۆکەوە هەردووکیان لەم شوێنەیاندا بۆ مەبەستی مەرج بەکارهێنراون. واتە ڕوودانی کاری (بایەخ بدرێت) مەرجە بۆ ڕوودان و ئەنجام دانی کاری (پێشدەکەوێت). بۆیە بەم شێوانەی ڕێژەی کار لە بەکارهێناندا دەگوترێ شێوازی مەرج.

لە ڕستەی شەشەمدا کاری (هات) ڕێژەکەی ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندنەکاری (دێچین) ڕێژەکەی ڕانەبردووی ڕاگەیاندنە، ئەمە لە ڕووی ڕێژەوە، بەڵام لە ڕووی ناوەڕۆکەوە هەردووکیان لەم شوێنەیاندا بۆ مەبەستی مەرج

بەکارهێنراون. واتە ڕوودانی کاری (هات) مەرجە بۆ ڕوودانو ئەنجام دانی کاری (دێ چین). بۆیە بەم شێوانەی ڕێژەی کار لەبەکار هێنانـدا دەگوترێ شێوازی مەرج.

لەڕستەی حەوتەمدا کاری (چوو) ڕێژەکەی ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندنە، کاری (ببەوە) ڕێژەکەی داخوازییە، ئەمە لەڕووی ڕێژەوە بەڵام لە ڕووی ناوەڕۆکەوە هەردووکیان لەم شوێنەیاندا بۆ مەبەستی مەرج بەکارهێنراون. واتە ڕوودانی کاری (چوو) مەرجە بۆ ڕوودانی کاری (ببەوە). بۆیە بەم شێوانەی ڕێژەی کار لەبەکارهێناندا دەگوترێ شێوازی مەرج.

کەواتە لەم ڕستانەی سەرەوەدا ئەوەی بۆمان ئاشکرا دەبێت ئەمانەی خوارەوەن.

١- ڕستەی شێوازی مەرجی هەمیشە ڕستەیەکی ئاوێتەی مەرجەو لە دوو ڕستەی سادە پێکهاتووە.

**ئ- ڕستەی کاری مەرج یا پاڕستە.**

**ب- ڕستەی وەڵامی مەرج کە ڕستەیەکی سەرەکییەو مەبەستەکە لەم ڕستەیە دەردەکەوێت. هەروەها پێی دەگووترێت شاڕستە.**

٢- لە ڕستەی ئاوێتەی مەرجدا (ڕستەی شێوازی مەرجیدا) کار ڕێژەی تایبەتی خۆی نییە، بەڵکو هەر ئەوکارانەن کە لەشێوازی (ڕاگەیاندن ، دانانی ، داخوازی) بەکار هێنراون بەڵام لێرەدا بۆ مەبەستی بنجی خۆیان بەکار نەهێنراون، بەڵکو بۆمەبەستی مەرج بەکار هێنراون.

٣- لەڕستەی کاری مەرج (پاڕستە) ڕێژەی کار هەمیشە (ڕاگەیاندنە یا دانانییە)، لە ڕستەی وەڵامی مەرجیشدا ( شاڕستە) ڕێژەی کار هەمیشە (ڕاگەیاندنە یا داخوازییە).

٤- له ڕستەی ئاوێتەی مەرجدا بەشێوەیەکی گشتی ڕستەی کاری مەرج دەکەوێتە سەرەتای ڕستەکە، بەڵام دەگونجێ هەندێ جار ڕستەی وەڵامی مەرج بکەوێتە سەرەتای ڕستەکە.

وەکو: دەچین بۆ سەیران، کە نەورۆز هات.

گوڵەکانم چاندووە، ئەگەر ئاژەڵ نەیان خوات.

٥- له ڕستەی ئاوێتەی مەرجدا ئامرازی لێکدەر(تا، هەتا، کە، هەکە، کەی، ئەگەر....) پێیان دەگوترێ ئامرازی لێکدەری مەرج.

**بەکورتی:**

**ئ- لەکاتی بەکارهێنانی کار لە ڕستەدا ئەگەر ڕوودانی کارێك مەرج بێت بۆ ڕوودانی کارێکی تر، لەو بارەیدا بەو کارە، بەڕێژەو ناوەڕۆکییەوە دەگوتریٚ ڕستەی ئاوێتەی مەرج (شێوازی مەرج).**

**ب: ڕستەی ئاوێتەی مەرج لەدوو ڕستە پێکدێت:**

**ڕستەی کاری مەرج، ڕوودان و بەئە نجام گەیاندنی کاری ئەم ڕستەیە مەرجە بۆ ڕوودانی کاری ڕستەی وەڵامی مەرج، ڕستەی وەڵامی مەرج کە ڕستەیەکی سەرەکییە، ڕوودان و بە ئە نجام گەیاندنی کاری ئەم ڕستەیە بەستراوەتەوە بەڕوودانی کاری ڕستەی کاری مەرج.**

## ڕاهێنان (١)

لەڕستەی ئاوێتەی مەرجدا چەند جۆرە کار هەیە؟ لە چ ڕێژەیەکدا دەبن و بۆ چ بەکاردەهێنرێن؟ بە نموونە ڕوونی بکەوە.

## ڕاهێنان (٢)

لەڕستەی (زوو برۆ، کارەکە ئەنجام بدە).

١- هەردوو کار لە چ ڕێژەیەکدان؟

٢- بکەری هەردوو ڕستەکە دیاربکە؟

٣- لەکاری (برۆ) ڕێژەی ڕابردووی نزیکی دانانی دروست بکە و لەکاری (ئەنجام بدە) ڕێژەی ڕابردووی بەردەوامی ڕاگەیاندن دروست بکە، ئینجا ڕستەکە بەشێوەی ڕستەی ئاوێتەی مەرج بنووسەوە.

## ڕاهێنان (٣)

لەڕستەی (کەی نەورۆز هات، ئاگری خۆشیی هەڵدەکەین).

١- جۆری ڕستەکە دیاربخە؟

٢- وشەی (کەی) شیبکەوە.

٣- وشەی (هات، هەڵدەکەین) شی بکەوە.

٤- ئەم ڕستەیە لە چەند ڕستە پێکهاتووە و هەریەکەیان چی پێ دەگوترێت؟ ئایا دەتوانین جێیان بگۆڕین؟

## ڕاهێنان (٤)

ئایا لەڕستەی شێوازی مەرجیدا کار ڕێژەی تایبەتی خۆی هەیە؟ بە نموونە ڕوونی بکەوە.

## ڕاهێنان (٥)

نموونەیەك لە شیكردنەوە.

ئەگەر ئەوان هاتبان، كارەكەیان ئەنجام دەدا.

ئەگەر ئەوان هاتبان: ڕستەی كاری مەرجە.

ئەگەر: ئامرازی لێكدەری مەرجە.

ئەوان: جێناوی كەسی سەربەخۆیە، بۆ كەسی سێیەمی كۆ، بكەرە.

هاتبا: كاری ڕابردووی نزیكی دانانییە، لێرە بۆ مەرج بەكارهاتووە، كاری مەرجە، تێنەپەڕە.

ن: جێناوی كەسی لكاوە، بۆ كەسی سێیەمی كۆ، بۆ بكەر دەگەڕێتەوە.

كارەكەیان ئەنجام دەدا: ڕستەی وەڵامی مەرجە

كارەكە: ناوە، تاكە، ناسراوە، بەركارە.

یان: جێناوی لكاوە بۆ كەسی سێیەمی كۆ، بكەرە.

ئەنجام دەدا: كاری ڕابردووی بەردەوامی ڕاگەیاندنە، لێرە بۆ مەرج بەكارهاتووە، كاری وەڵامی مەرجە، لێكدراوە، تێپەڕە.

تۆش ئەم ڕستانەی خوارەوە شی بكەوە.

ئـ: كەی بوویت بە ئەندازیار، گوندەكان ئاوەدان بكەرەوە.

ب: ئەگەر باش بخوێنیت، دەردەچیت.

# کاری چاوگی (بوون)

(ئـ)

| | | |
|---|---|---|
| ١- پارەم هەبوو. | پارەم هەیە. | پارەم دەبێت. |
| ٢- هەم بوو. | هەمە. | دەمبێت. |
| ٣- نازەنین منداڵی بوو. | نازەنین منداڵی هەیە. | نازەنین منداڵی دەبێت |

(ب)

| | |
|---|---|
| ١- چراکە هەڵبوو. | هەڵدەبێت. |
| ٢- ئازاد ژ خەو ڕابوو. | ڕادەبێت. |
| ٣- کارەکە تەواو بوو. | تەواو دەبێت. |
| ٤- کاوە سوور بوو لەسەر بڕیارەکەی | سوور دەبێت. |

(پ)

١- کاوە مامۆستایە.

٢- پێشکەوتنمان بە خوێندنە.

٣- هاوینە هەواری شەقلاوە فێنکە.

٤- ئاهەنگەکە بەشەو بووە.

(ت)

١- ڕەنگە ئاوەکە ببێت بە سەهۆڵ.

٢- سەرکەوتن بە تێکۆشانە.

٣- پێنووسەکەی تۆ بە من بوو.

٤- هەنارەکان ترشن.

( چ )

١- دەبوو[1] چووبام لە گەڵتان.

٢- دەبوو یارمەتیم دابا.

٣- دەبێت ئەمساڵ دەربچم.

چاوگی (بوون) وەکو هەموو چاوگێکی دی، سەرچاوەیە بۆ دروستبوونی دەمەکانی کاری (ڕابردوو، ڕانەبردوو)، کە بریتین لە:-

١- ڕابردوو : بوو

٢- ڕانەبردوو ← (ە) بۆ دەمی ئێستا.

← (دەبێت) بۆ دەمی داهاتوو.

ئەم کارانە وەکو کاری (تەواو) و (ناتەواو) بە تێپەڕو تێنەپەڕ، لە ڕستەی کوردیدا ئەرکەکانیان ئەنجامدەدەن.

## کاری تەواو:

ئەو کارانەی لە چاوگی (بوون) پەیدادەبن، وەکو کاری تەواوی تێپەڕ لە ڕستەدا دەردەکەون، لە کاتێکدا ئەگەر بۆ خاوەنداریێتی (تملك) یان بۆ منداڵبوون بەکارهات، ئەو دەمە دەبنە کاری تەواوی تێپەڕ لە ڕێگای بەرکارەکانیانەوە، ئەرکەکانیان ئەنجامدەدەن، ئەم کارانە لەبنەڕەتدا لە چاوگی (هەبوون)ەوە سەرچاوەیان گرتووە، بەڵام وشەی (هە) لە هەندێك باری ڕستەدا دەرناکەوێت یان ناوترێت، هەروەکو لە ڕستەکانی بەشی (أ) دا دەردەکەون.

---

[1] هەروا (دەبوایە)ش دەبێت.

| پارەم هەبوو. | پارەم هەیە. | پارەم دەبێت. |
| --- | --- | --- |
| هەم بوو. | هەمە. | دەمبێت |

لـە ڕسـتـەی (پـارەم هـەبوو..........) (بـوو) کـاری تـەواوی تێپـەڕە، بەرکارەکـەی وشـەی (پـارە)یـە، جێناوەکەشـی (م)ە، کـە بـووە بـە بکـەری ڕستەکە.

لـە ڕسـتـەکانی (هـەم بـوو)[1] وشـەی (هـە) لەگـەڵ کـاری ڕابـردوو (بـوو) و ڕانەبردوو (ە) بۆ دەمی ئێستا دەرکەوتووە، بەڵام لـە ڕانـەبردوودا بـۆ دەمـی داهاتوو لە شێوەی (دەمبێت)دا کەوتووەتە بەر چاو.

هەر لەم چاوگەوە کاری تەواوی تێنەپەڕ ساز دەکرێت، ئەگەر سەرنج بدەینـە ڕستەکانی بەشی (ب) دەبینین:

کارەکان وەکو کاری تـەواوی تێنەپـەڕ، لـە ڕسـتـەکاندا دەرکـەوتوون بەتـەنها ئەرکی بکەرەکانیان ئەنجامداوەو واتای ڕستەکانیان تەواوکردووە.

لە ڕستەی (١–٢)دا بەهۆی پێشگری (هەڵ ، ڕا) وە کاری داڕێژراوی تـەواوی تێنەپەڕیان پێکهێناوە، کە بەتەنها ئـەرکی بکـەرەکانیان ئەنجامـداوە، واتـای ڕستەکانیان تەواوکردووە، بەڵام لە ڕستەی (٣ ، ٤)دا، کارەکـان هەریەکـەیان لەگـەڵ وشـەی (تـەواو ، سـووڕ)دا کـارێکی لێکـدراوی تـەواوی تێنەپـەڕیان پێکهێناوە، ئەرکی بکـەرەکانیان گەیاندووەتـە ئـەنجام و واتـای ڕسـتـەکانیان تەواوکردووە.

---

[1] ئەگەر بە واتای بوون (الوجود) هات، ئەو دەمە دەبێتە کاری تەواوی تێنەپەڕ.

من هەبووم– من هەم– من دەبم (وجود).

## کاری ناتەواو:

لـە هەنـدێك بـاری ڕسـتـەدا کارەکـانی (بـوو —ە— دەبێـت)، ناتوانێـت ئـەرکی نیهادەکانیان ئەنجامبدەن، یان واتای ڕستەکان تـەواو بکـەن، بـەڵکو بـۆ ئـەو مەبەستە پێویستیان بە وشە یان بەشێکی تر دەبێت، بۆ ئـەوەی ئـەو ئەرکـە تەواو بکـەن، ئـەو دەمـە بـەو کارانـە دەوترێـت کـاری (ناتـەواو)، ئـەو وشـەو بەشانەش، کە دەبنە پاڵپشت بۆ ئەو تەواوکردنە پێیان دەوترێت (تەواوکەر)، کە بریتین لە (نـاو ، جێنـاو ، هاوەڵنـاو، هاوەڵکـار، چـاووگ)، کـە بەشـێوەی تەواوکـەر و تەواوکـەری بەیاریـدە ئـەرکی تـەواوکردنی کـارە ناتەواوەکـە ئەنجامدەدەن. لێرەدا با بزانین ئەم تەواوکردنە چۆن و بە چ شێوەیەك تـەواو دەکرێن، ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی بەشی (پ) دەبنین:

لە ڕستەی (١)دا ناوی (مامۆستا[١])، کە نـاوێکی گشـتییە، تەواوکـەری کـاری (ە)ی ناتەواوە، ئەگـەر ئـەم نـاوە نەبووایـە، کـاری (ە) لەگـەڵ نیهادەکەیـدا، نەیدەتوانی واتای ڕستەکە تەواو بکات.

لە ڕستەی (٢)دا، بـە هـەمان شـێوە، چـاوگی (خوێنـدن)، کـە وەکـو نـاوێکی واتایی لـە ڕسـتەکە دەردەکـەوێت، ئـەرکی تـەواوکردنی کـاری (ە) ناتـەواوی وەرگرتـــووە، ئەگـــەر ئـــەم نـــاوە نەبووایـــە، کـــاری ناتـــەواوی (ە) لەگـــەڵ نیهادەکەیدا، نەیدەتوانی واتای ڕستەکە تەواوبکات.

---

(١) هەموو ناوێك (گشتی، واتایی ، تایبەتی) دەبنە تەواوکەر بۆ کاری ناتەواو.

* هەموو جێناوێکی جودا (کەسی جودا، پرس، خۆیی، نادیار، نیشانە) هەروەها جێناوی هەیی لەگەڵ دیار خەرەکەی دەبێتە تەواوکەری کاری ناتەواو.

لـە ڕسـتـەی (٣)دا، هاوەڵنـاوی چـۆنیەتی (فێنـك) ئـەرکی تـەواوکردنی کـاری (ە)ی ناتەواوی وەرگرتووە، ئەگەر ئەم هاوەڵناوە نەبووایە، کـاری (ە)لەگـەڵ نیهادەکەی دا نەیدەتوانی واتای ڕستەکە تەواو بکات.

لە ڕستەی (٤)دا، هاوەڵکاری (بەشەو)ئـەرکی تـەواوکردنی (بـوو)ی ناتـەواوی وەرگرتووە، ئەگـەر ئـەم هاوەڵکارە نەبووایـە کـاری ناتـەواوی (بـوو) لەگـەڵ نیهادەکەیدا نەیدەتوانی واتای ڕستەکە تەواو بکات.

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی بەشی (ت)، دەبینین:

لـە ڕسـتـەی (١)دا، نـاوی (سـەهۆڵ) تەواوکـەری بەیاریـدەی کـاری ناتـەواوی (دەبێـت)،ە، ئەگـەر ئـەم نـاوە نەبووایـە، کـاری ناتـەواوی دەبێـت لەگـەڵ نیهادەکەیـدا، نەیـدەتوانی واتـای ڕسـتـەکە تـەواوبکات، بوونایـەتیو ئـەو گۆڕانکارییە دەربخات، کەبەسەر ناوەکەدا هاتووە.

لە ڕستەی (٢) دا، چاوگی (تێکۆشان) کە وەکوو ناوێکی واتـایی، تەواوکـەری بەیاریدەی کاری ناتەواوی(ە)یە ئەگەر ئەم ناوە نەبووایە، کاری ناتـەواوی(ە) لەگەڵ نیهادەکەیدا، نەیدەتوانی واتای ڕستەکەی تەواو بکات.

لە ڕستەی (٣)دا، جێناوی کەسی جودای (من) تەواوکـەری بەیاریـدەی کـاری (بوو)ی نا تـەواوە، ئەگەر ئەم جێناوە نەبووایە، کاری (بوو)ی ناتـەواو لەگـەڵ نیهادەکەیـدا، نەیـدەتوانی واتـای ڕسـتـەکە تـەواوبکاتو ئـەو گۆڕانکارییـە نیشانبدات، کە لەجێناوی (تۆ)وە چووە بۆ جێناوی (من).

لێـرەدا پێویسـتـە ئـەوە بزانرێـت، کـە هەرچـی( هاوەڵنـاو، هاوەڵکـار)ە، بـە شێوەی تەواوکەر، کاری ناتەواو تەواو دەکەن. هەر ئەم کارە لە چەند بارێکی تردا وەکو کاری یاریدەدەر، لەگەڵ کارەکـانی شـێوازی دانـانی دەردەکـەون، هەروەکو لە ڕستەکانی بەشی (جـ)دا، لە شێوەی (دەبوو، دەبووایە دەبێت)،

که هەمیشە دەکەونە پێش کارە سەرەکییەکانەوە، بۆ دەرخستنی هەندێك لایەنی ڕێزمانیی بۆ کارە سەرەکییەکان.

نەرێ کردنی ئەم کارە:

ئـ- دەمی ڕابردوو:

بە دانانی نیشانەی (نە)ی نەرێ لەبەردەم کارەکەدا.

پارەم بوو. ← پارەم نەبوو.

ئاهەنگەکە بە شەو بوو. ← ئاهەنگەکە بەشەو نەبوو.

دەبوو. ← نەدەبوو.

ب- دەمی ئێستا:

بە دانانی نیشانەی (نی) لەبەردەم کارەکەدا.

پارەم هەیە. ← پارەم نییە.

کاوە مامۆستایە. ← کاوە مامۆستا نییە.

پ - دەمی ڕانەبردوو

بە گۆڕینی نیشانەی (دە) بە نیشانەی (نا)

پارەم دەبێت. ← پارەم نابێت.

ئاوەکە دەبێت بە سەهۆڵ. ← ئاوەکە نابێت بە سەهۆڵ.

هەروەها دەبێت ئاماژە بەوە بکەین کە:

١- کاری ناتەواوی لە ڕووی کاریگەرییەوە (تێنەپەڕە).

٢- کاری (بوو - ە - دەبێت) لە هەموو بارێکدا ناکرێت بە بکەر نادیار .

٣- کاری نا تەواو (ە) بۆ دەمی ئێستا لە ڕستەدا دەرناکەوێت، ئەگەر جێناوە کەسییە لکاوەکان دیارو ئاشکرابن (م ، ین ، یت ، ن، (-) ، ن)، بە واتا کارەکە بکەوێتە نێوان (وشەکە)[1] و جێناوە کەسییە لکاوەکان

کوردم کوردین.

کوردیت کوردن.

کوردە کوردن.

**بە کورتی :**

**ئەو کارانەی لە چاوگی ( بوون )ەوە وەرەگیرێن، ئەگەر بۆ خاوەنداریێتی ( تملك ) یان لە منداڵبوون بەکارهاتن، دەبنەکاری تەواوی تێپەڕ.**

**بەشێوەیەکی گشتی، پێشگر، کە دەچێتە سەر ئەو جۆرە کارانە، کارەکە دەکەن بە کاری تەواوی تێنە پەڕی داڕێژراو.**

**کاری لێکدراو، کە لە چاوگی ( بوون )ەوە، وەردەگیرێت کەوشە واتادارەکەی بوو بە واتا بۆ کارەکە، ئەو دەمەکارەکە دەکات بە کارێکی تەواوی لێکدراوی تێنە پەڕ.**

**ئەگەر کاری ( بوو - ە - دەبێت ) نەیتوانی بە تەنها واتای ڕستەکە تەواو بکات، پێویستی بە وشە یان بەشێکی تر هەبوو، ئەو دەمە ئەو کارانە دەبنەکاری ناتەواو.**

**ئەو بابەتە ڕێزمانییانەی کاری ناتەواو تەواو دەکەن، وەکو تەواوکەر و تەواوکەری بەیاریدە، بریتین لە ( ناو - جێناو ).**

---

[1] مەبەست لەوشە (ناو ـ هاوەڵناو ـ جێناوە کەسییە سەربەخۆکان)ە.

## ئەرکی ( ە ) لە ڕێزمانی کوردیدا

١- دەبێتە کاری ناتەواو لە ڕستەی سادەدا، ئەگەر کاری سەرەکی لە ڕستەدا نەبوو. بۆ نموونە:

بەرزترین لوتکە لە چیاکانی کوردستاندا، ئاراراتە.

٢- دەبێتە جێناوی لکاو بۆ کەسی دووەمی تاك لە کاری داخوازیدا، ئەرکی بکەر دەبینێت. بۆ نموونە:

بخوێنە، تا دەربچیت.

٣- دەبێتە ئامرازی پەیوەندی، دەلکێت بە کاری ڕابردوو، ڕانەبردوو، داخوازی جێگای ئامرازی (بۆ ، بە) دەگرێتەوە.

کاوە هاتە لامان. - بۆ = کاوە هات بۆ لامان.

ئازاد دەبێتە ئەندازیار - بە = ئازاد دەبێت بە ئەندازیار.

بڕۆنە دەرێ. - بۆ = بڕۆن بۆ دەرێ.

٤ - هەندێك جار بە دوای ناو دادێت بۆ مەبەستی بانگکردن:

کورەبخوێنە، بەرچاوت تەمە.

٥- دەبێتە پاشگر بۆ دروستکردنی وشەی نوێ.

چاك ← چاکە.

سەوز ← سەوزە.

دەست ← دەستە.

٦- دەبێتە ئامرازی پێناسین، کە کورتکراوەی (ەکە)ی ناساندنە.

ژنە هەژاربوو، بۆیە دەگریا.

٧- دەبێتە ئامرازی لێکدەر بۆ دروستکردنی وشەی لێکدراو. بۆ نموونە:

ڕەشەبا، گوڵە گەنم.

٨- دەبێتە جێناوی کەسی لکاو. بۆ کەسی سێیەمی تاك لەگەڵ کاری ڕانەبردوو لە کرمانجی ژووروودا[1] . بۆ نموونە:

ئەو چیرۆکێ دنڤیسە.

ئەو دکەڤە.

٩- دەبێتە پاشگر لەگەڵ هەندێك قەدی چاوگدا بۆ دروستکردنی هاوەڵناوی کراوی دارێژراو

کرد ← کردە ، برد ← بردە.

کوشت ← کوشتە.

١٠- دەبێتە ئامرازی دانەپاڵ و گرێی ناوی دروست دەکات لەو کاتەی کە لە نێوان ناوێکی ناسراو ، دیار خراو بە هاوەڵناوی چۆنیەتی دێت بۆ نموونە:

مەڕە لاوازەکە،هەنارە مزرەکە

---

[1] : لە هەندێ ناوچەی ئەم شێوە زارەدا وای لێ دێت، ئەگینا لە ناوچەکانی تر دەگوترێت: (ئەودەرسێ دنڤیسیت).

## ڕاهێنان(١)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەرەوە؟

١- چۆن لە چاوگی (بوون) کاری تەواوی تێنەپەڕ دروست دەکرێت؟

٢- کاری ناتەواو بەچەند جۆرە وشە و چۆن تەواو دەکرێت؟

٣- کەی کاری ناتەواو بۆ دەمی ئێستا لە ڕستەدا دەرناکەوێت؟ کەی دەردەکەوێت؟.

## ڕاهێنان (٢)

لەم ڕستانەی خوارەوەدائەو کارانەی، کە لەچاوگی (بوون)ەوە وەرگیراون دەریان بهێنە؟ جۆرەکانیان دەسنیشان بکە؟.

١- گەلی کورد سوورە لەسەر بەدیهێنانی مافەکانی.

٢- دەبێت یەکڕیزی گەل بپارێزین.

٣- دایکیان کەمنداڵی بوو، منداڵەکە نەخۆش بوو.

٤- کێشەی ئاوارەکانی کەرکوک کەی پەیدابوو؟

٥- باوکیان لەخەو ڕابوو.

## ڕاهێنان (٣)

ئەرکی (ە) لەم ڕستانەی خوارەوەدا، دەستنیشان بکە لەگەڵ ڕوونکردنەوەی پێویست.

١- کوڕە، بە دانیشتن ماڵت وێرانە.

٢- بخوێنە، چونکە خوێندن سارێژکەری برینەکانتە.

٣- ڕەشەبای سلێمانی بە هێزە.

٤- چیرۆکەکێ بنڤیسە.

٥- منداڵە گەمەی دەکردو، دایکەش تەماشای دەکرد.

## ڕاهێنان (٤)

کاری (بوو) لە سێ ڕستەدا بەکاربهێنە، وەکو:

١- کاری ناتەواو.

٢ - کاری تەواوی تێپەڕ.

٣- کاری یاریدەدەر.

## ئەرکی جێناوە کەسییە لکاوەکان

### یەکەم: وەکو بکەر

- ئـ -

١- دوێنێ، گۆڤارێکم کڕی.

دوێنێ کڕیم.

٢- گۆڤارەکەم هەڵگرتبوو.

هەڵم گرتبوو.

٣- قوتابییەکەم بانگ دەکرد.

بانگم دەکرد.

٤- تاوانبارەکەم دەست نیشان کرد.

دەست نیشانم کرد.

- ب -

١- پێرێ چووم بۆ کەرکووك.

٢- لە تاقیکردنەوەکەدا بەیەکەم دەرچووم.

٣- خێرا هاتنەوە.

٤-سەرکەوتینەوە سەر شاخەکە.

- پ -

١- وانەکە دەخوێنین.

٢- گوندەکان ئاوەدان دەکەینەوە.

٣- لە پێناوی نیشتیماندا تێدەکۆشین.

- ت -

١- نەمامەکە بڕوێنە.

٢- ناوی خوێندکارەکان تۆمار بکەن.

مەبەست لە ئەرکی جیناوە کەسییە لکاوەکان لە دەوری بکەردا، ئەوەیە، کە هەروەك چۆن ناو، یان جێناوە سەربەخۆکان بە هەموو جۆرەکانییانەوە، لە ڕستەدا دەبن بە (کارا) بکەر، هەروەك لە قۆناغەکانی ڕابردووی خوێندندا ڕوونکراوەتەوەو دەرخراوە، هەر بەم جۆرەش جێناوە لکاوەکان دەبنە بکەر لە ڕستەدا، جا ئەگەر بە وردی سەیری ڕستەکانی سەرەوە بکەین دەبینین:

یەکەم– لە هەموو ڕستەکانی بەشی (ئـ) دا کارەکان هەموویان کاری ڕابردووی تێپەڕن، هەیانە سادە، داڕێژراو یان لێکدراون و لێرەدا شوێنی جیناوە کەسییە لکاوەکان، ئەوانەی دەبنە بکەر نیشان دەدەین.

ئـ– ئەگەر کاری ڕستەکە ڕابردووی تێپەڕی سادە بێت و بەرکار لە ناو ڕستەکەدا باسکرابێت، ئەوا هەمیشە جێناوی لکاوی بکەر دەچێتە دوای بەرکارەکە، وەکو لە ڕستەی یەکەمی بەشی (ئـ) دا دەرکەوتووە، لەم ڕستەیەدا وشەی (گۆڤارێك) بەرکارەو جێناوی کەسی لکاوی (م) بکەری کارەکەیەو کارەکەش ڕابردووی تێپەڕی سادەیەو ئەگەر بەرکار، باس نەکرێت جێناوی لکاو دەچێتە کۆتایی کارەکە وەکو کڕیم.

ب– ئەگەر کاری ڕستەکە ڕابردووی تێپەڕی داڕێژراو یان لێکدراو بوو، بەرکار باسکرابوو، ئەوا دیسان جێناوی لکاوی بکەر دەچێتە دوای بەرکارەکەوە، وەکو لە ڕستەکانی (٢–٣)ی بەشی (ئـ)دا دەرکەوتووە، بەڵام ئەگەر بەرکارەکە باس نەکرابوو، ئەوا جێناوی کەسی لکاوی بکەر دەچێتە دوای بەشی یەکەمی کارەکە؟ وەك (هەڵم گرتبوو، بانگم دەکرد).

پ– ئەگەر کارە لێکدراوەکە لە سێ وشەی واتادار یان زیاتر پێکهاتبوو، واتە بەشی یەکەمی کارە لێکدراوەکە وشەیەکی لێکدراو بوو، ئەوا جێناوی کەسی لکاوی بکەر دەکەوێتە دوای وشە لێکدراوەکە کاتێك بەرکار لادەبرێت ، وەك

له ڕستەی (٤)ی بەشی (ئـ)دا دەركەوتووە، ئەگەر سەیری جێناوە لكاوەكـان بكەین لە ڕستەكانی بەشی (ئـ)دا، دەبینین لە هەموویاندا جێناوی كەسی لكاو (م)ە، جا دەتوانین بە پێی مەبەست لە بری ئەم جێناوە، جێناوەكانی

(م–مان، ت– تان، ی–یان) بە ڕیز بەكار بهێنین.

دووەم– ئەگەر كاری ڕستەكە، كارێكی ڕابردووی تێنەپەڕ بـوو، ئـەوا جێنـاوە كەسییە لكاوەكانی (م ، ین ، یت ، ن، Ø ، ن) دەبنە بكەرو دەچـنە كۆتـایی كاری ڕستەكە، جا كارەكە (سادە، داڕێژراو – لێكدراو) بێت، خۆ ئەگەر كاری ڕستەكە داڕێژراو یان لێكدراو بوو، بە پاشـگری (ەوە) كۆتـایی هـاتبوو، ئـەوا جێناوی كەسی لكـاوی بكـەر دەكەوێتـە پـێش ئـەم پاشـگرەیەوە، وەكـو لـە ڕستەكانی (٣–٤)ی بەشی (ب) نیشاندراوە، هەروەها پێویستە ئامـاژە بـەوە بكەین، ئەگەر كاری ڕستەكە ڕابـردووی تێنەپـەڕ بێـت، ئـەوا جێنـاوی كەسـی لكاوی بكەر بۆ كەسی سێیەمی تاك دەرناكەوێت.

سێیەم– ئەگـەر كـاری ڕسـتەكە ڕانـەبردووی (تێپـەڕو تێنەپـەڕ) بێـت، ئـەوا جێناوە كەسیەلكاوەكانی كۆمەڵەی (م، ین– یت، ن – (ات : ێت) ، ن) دەینە بكـەرو دەچـنە سـەر كۆتـایی كارەكـە، جـا ئەگـەر كـاری ڕسـتەكە (سـادە، داڕێژراو، یان لێكدراو) بێت. جێناوی كەسی لكاوی بكەر بـۆ كەسـی سـێیەمی تاك بە پێی پیتی كۆتایی ڕەگی كارەكە دەگۆڕێت، ئەگەر ڕەگـی كارەكـە بـە پیتـی بزوێنـی (ە ، ۆ) كۆتـایی هـاتبوو، جێنـاوی كەسـی لكـاوی (ات) بـەكار دەهێنرێت، وەك (دەشوات – دەڕواتەوە– دادەخات– چاپ دەكـات ......)، بەڵام ئەگەر ڕەگی كارەكە بـە پیتـی (بزوێنـی (ە، ۆ) كۆتـایی نـەهاتبوو ئـەوا جێنــاوی كەســی لكــاوی (ێـت) بــەكار دەهێنرێـت، وەكـو (دەنووسـێت – هەڵدەفڕێت – دەفرۆشێت... هتد).

چوارەم– ئەگەر کاری ڕستەی داخوازی (تێپەڕ یان تێنەپەڕ)ی (سادە، دارێژراو، لێکدراو) بێت ئەوا جێناوە کەسییەلکاوەکانی (ە– ن) دەبن بەبکەر و دەچنە کۆتایی رەگی کارەکە.

**بەکورتی:**

**١- ئەگەر کاری ڕستەکە ڕابردووی تێپەڕ بێت جێناوە کەسییە لکاوەکانی (م–مان، ت- تان، ی- یان) دەبنە بکەری ڕستەکەو شوێنیان لەناو ڕستەکە دەگۆڕێت:-**

**ئـ- ئەگەر کارەکە (سادە، دارێژراو- لێکدراو)بێت و بەرکار باسکرابێت، ئەوا جێناوی کەسی لکاوی بکەر دەچێتە دوای بەرکارەکە.**

**ب- بەڵام ئەگەر بەرکارەکە باس نەکرابێت، کارەکەش سادە بێت، ئەوا جێناوە کەسییەلکاوەکان دەچنە سەر کارە سادەکە ئەگەر لە دەمی ڕابردووی نزیك و دووری ڕاگەیاندن بوو جێناوەکان دەچنە کۆتایی کارەکە. بەڵام ئەگەر لەدەمی ڕابردووی بەردەوامی ڕاگەیاندن بوو جێناوەکان دەچنە دوای نیشانەی (دە)، خۆ ئەگەر لە دەمی ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندن بوو جێناوەکان دەچنە نێوان نیشانەی (وە).**

**خۆ ئەگەر کارەکە( دارێژراو یان لێکدراو) بوو، ئەوا دەچنە دوای بەشی یەکەمی کارەکە.**

**٢- ئـ- بەڵام ئەگەر کاری ڕستەکە (ڕابردووی تێنە پەڕ) بێت، جێناوە کەسییە لکاوەکانی کۆمەڵەی (م – ین، یت- ن، (Ø)- ن) ئەرکی بکەر دەبینن و دەکەونە کۆتایی کارەکە.**

ب- ئەگەر کاری ڕستەکە (ڕانەبردووی تێنە پەڕ و تێپەڕ) بێت، جێناوە کەسییە لکاوەکانی کۆمەڵەی (م- ین، یت- ن) (ێت - ات)- ن) دەکەونە کۆتایی رەگی کارەکەوە.

٣- ئەگەر کارەکە داخوازی بێت ئەوا جێناوی کەسی لکاوی (ە- ن )دەبن بە بکەرو دەکەونە کۆتایی رەگی کارەکە.

## ڕاهێنان (١)

کەی ئەم جێناوە کەسییە لکاوانەی خوارەوە لەناو ڕستەکەدا وەکو بکەر دەوری خۆیان دەبینن، بۆ هەریەکەیان نموونەیەك بهێنەوە.

(ات ، مان ، ین ،ە)

## ڕاهێنان (٢)

١- ئەگەر کاری ڕستە ڕابردووی تێپەڕی (داڕێژراو یان لێکدراو) بێت، کام لەم جێناوە کەسییە لکاوانە وەکو بکەر دەردەکەون و دەچنە کوێ؟ بەنموونەوە وەڵامەکانت بسەلمێنە.

٢- کەی جێناوی لکاوی بکەر بۆ کەسی سێیەمی تاك لە ڕستەدا دەرناکەوێت؟ بە نموونەوە وەڵامەکەت بسەلمێنە.

## ڕاهێنان (٣)

لە ڕستەی (وتارەکەت بڵاوکردووەتەوە)

١- کاری ڕستەکە لە چ ڕێژەیەکدایە؟ چۆن دروستکراوە؟

٢- (ت) لە کۆتایی وتارەکەت چییەو ئەرکی چییە؟ بۆچی خراوەتە ئەوێ؟

٣- وشەی وتارەکە شی بکەوە.

٤- ئەگەر وشەی وتارەکە لاببرێت (ت) دەچێتە کوێ؟ بۆچی.

## ڕاهێنان(٤)

لە ڕستەی (لە وانەکان باش تێگەیشتووە).

١- کوا بکەری ڕستەکە ؟ بۆچی؟

٢- کاری ڕستەکە بگۆڕە بۆ ڕێژەی ڕانەبردووی ڕاگەیاندن، چ گۆڕانێك ڕوودەدات بینووسەوە.

٣- وشەی (وانەکان) شی بکەوە.

٤- وشەی (باش) چییە؟ ئەرکی چییە؟

## دووەم- وەکو بەرکار

ئـ: (م ـ مان ، ت ـ تان ، ی ـ یان)

| | |
|---|---|
| ١- بم بەخشن. | بمان بەخشن. |
| بی بەخشن. | بیان بەخشن. |
| ٢- وەرم بگرە. | وەرمان بگرە. |
| وەری بگرە. | وەریان بگرە . |
| ٣- بانگم بکەن. | بانگمان بکەن. |
| بانگی بکەن. | بانگیان بکەن. |

ب:

| | |
|---|---|
| ١- دەم ناسێت. | دەمان ناسێت. |
| ٢- هەڵت دەبژێرن. | هەڵتان دەبژێرن. |
| ٣- هانی دەدات. | هانیان دەدات. |

پ:

| (١) | (٢) |
|---|---|
| گرتمی - گرتینی | گرتمی - گرتمانی. |
| گرتیتی - گرتنی | گرتتی - گرتتانی. |
| گرتی - گرتنی. | گرتی - گرتیانی. |
| دای مەزراندم - دای مەزراندین. | دامی مەزراند - دامانی مەزراند. |
| دای مەزراندیت - دای مەزراندن. | داتی مەزراند - داتانی مەزراند. |
| دای مەزراند - دای مەزراندن. | دای مەزراند - دایانی مەزراند. |

| | |
|---|---|
| یارمەتیی دام – یارمەتیی داین. | یارمەتیمی دا – یارمەتیمانی دا. |
| یارمەتیی دایت – یارمەتیی دان. | یارمەتیتی دا – یارمەتیتانی دا. |
| یارمەیتی دا – یارمەتیی دان. | یارمەتی دا – یارمەتیانی دا. |

لەمەو پێش ئەوە فێربووین، کە بەرکار هەمیشە لەگەڵ کاری تێپەڕ دێتەکایەوە، ئینجا لێرەدا دەمانەوێت بزانین، کە جێناوە کەسییە لکاوەکان چۆن دەبنە بەرکار لە ڕستەدا؟

لەوەڵامدا دەڵێین، جێناوە کەسییە لکاوەکان دەبنە بەرکار لە ڕستەدا بەم شێوەیەی خوارەوە:

**ئـ/** ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (ئـ) بکەین، دەبنیین کارەکانی (ببەخشن، وەربگرە ، بانگ بکەن) هەموویان کاری داخوازی تێپەڕن، لەگەڵ ئەم کارانەدا کۆمەڵە جێناوی کەسیی لکاوی (م ــ مان ، ی ــ یان) دەبنە بەرکار، جا ئەگەر کاری داخوازی تێپەڕ (سادە) بوو، ئەوا جێناوی کەسیی لکاو لە دەوری بەرکاردا دەچێتە دوای نیشانەی (بـ) وەکو لە ڕستەی (بم بەخشن ــ بمان بەخشن .......) دیارە، بەڵام ئەگەر کاری داخوازی تێپەڕ (دارێژراو یان لێکدراو) بوو، جێناوی کەسیی لکاو لە دەوری بەرکاردا دەچێتە دوای بەشی یەکەمی کارەکەوە، وەکو لە ڕستەکانی (وەرم بگرە ــ وەرمان بگرە......) یان (بانگم بکەن ـ بانگمان بکەن.......) نیشاندراوە.

**ب/** ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (ب) بکەین، دەبینین کارەکانی (دەناسێت ، هەڵدەبژێرن ، هان دەدات) هەموویان کاری ڕانەبردووی تێپەڕن، لەگەڵ ئەم کارانەدا کۆمەڵەی جێناوی کەسیی لکاو (م ـ مان ، ت ـ تان ، ی ــ یان) دەبنە بەرکار، جا ئەگەر کاری ڕانەبردووی تێپەڕ سادە بێت، جێناوی لکاوی بەرکار دەچێتە دوای نیشانەی (دە) وەکو لە ڕستەکانی (دەم ناسێت ــ دەمان ناسێت

.........) نیشاندراوه، بەڵام ئەگەر کاری ڕانەبردووی تێپەڕ (داڕێژراو یان لێکدراو) بێت ئەوا جێناوی کەسیی لکاوی بەرکار دەچێتە دوای بەشی یەکەمی کارەوە، وەکو لە ڕستەکانی (هەڵت دەبژێرن ـ هەڵتان دەبژێرن.....)، یان (هانی دەدات ـــ هانیان دەدات) دا نیشاندراوە.

**پ/** ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (پ) بکەین، دەبینین کارەکانی (گرت ـــ دامەزراند ـــ یارمەتی دا) ڕابردووی تێپەڕن، لەگەڵ ئەم کارانەدا هەردوو کۆمەڵە جێناوە کەسیە لکاوەکان دەبنە بەرکار لە دوو شێوەدا:—

١— کۆمەڵە جێناوی کەسییی لکاو (م ـــ ین ، یت ـــ ن ، Ø ـــ ن) دەبنە بەرکار، جا ئەگەر کارەکە (سادە) بێت، ئەوا جێناوی لکاوی بەرکار دوای جێناوی لکاوی بکەر دەکەون، ئەگەر کەسی یەکەم یا دووەم (تاك و کۆ) بکەری ڕستەکە بن وەك: (گرتمن ـ ناردمیت)

خۆ ئەگەر جێناوی لکاوی بکەر کەسی سێیەمی تاك یان کۆ بێت، ئەوا جێناوی کەسیی لکاوی بەرکار پێش جێناوی کەسیی لکاوی بکەر دەکەوێت، وەکو (گرتمی ـ گرتنی ـ ناردمیان).

خۆ ئەگەر کارەکە(داڕێژاو یان لێکدراو) بێت، ئەوا جێناوی کەسی لکاوی بەرکار دەچنە کۆتایی کارەوە، وەکو لە ڕستەکانی (دای مەزراندم ـــ دای مەزراندین.....) یان یارمەتیی دام ـ یارمەتیی داین...) نیشاندراون.

٢— کۆمەڵە جێناوی کەسیی لکاو (م ـــ مان، ت — تان ، ی ـــ یان) دەبنە بەرکار، جا ئەگەر کاری ڕستەکە ڕابردووی تێپەڕی (سادە) بێت، ئەوا کۆمەڵە جێناوە کەسییەکە لە دەوری بەرکاردا دەچنە نێوان کۆتای کارەکە و جێناوی لکاوی بکەرەوە، وەکو لە ڕستەکانی (گرتمی ـــ گرتمانی ...) نیشاندراوە، بەڵام ئەگەر کاری ڕستەکە ڕابردووی تێپەڕی (داڕێژراو یان

لێکدراو) بێت، ئەوا جێناوی لکاوی بەرکار دەچنە دوای بەشی یەکەمی کارەکە وەکو لە ڕستەکانی (دامی مەزراند ــ دامانی مەزراند...) یان (یارمەتیمی دا ــ یارمەتیمانی دا...) نیشاندراون.
لێرەدا دەردەکەوێت، ئەگەر کارەکە ڕابردووی تێپەڕ (سادە ، دارێژراو ، لێکدراو) بێت، ئەوا جێناوی لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاك لە دەوری بەرکاردا دەرناکەوێت، هەرچەند لە کۆمەڵەی جێناوی (م ــ مان....) جێناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاك لە دەوری بەرکاردا هەیە، بەڵام بۆ ئاسانکردنی دەربڕین ئەمیش دەرناکەوێت.

**بەکورتی:**

**١- لەگەڵ کاری داخوازی تێپەڕی ( سادە ، دارێژراو ، لێکدراو ) کۆمەڵە جێناوی لکاوی ( م ــ مان ، ی ــ یان ) دەبنە بەرکار، جا ئەگەر کارەکە سادەبێت ئەوا دەچنە سەر نیشانەی ( بـ )، خۆ ئەگەر کارەکە ( دارێژراو یان لێکدراو ) بێت، ئەوا دەچنە دوای بەشی یەکەمی کارەکە.**

**٢- لەگەڵ کاری ڕانەبردووی تێپەڕی ( سادە ، دارێژراو ، لێکدراو ) کۆمەڵە جێناوی لکاوی ( م ــ مان ، ت ــ تان ، ی ــ یان ) دەبنە بەرکار، ئەگەر کارەکە سادەبێت جێناوی لکاوی بەرکار دەچێتە سەر نیشانەی ( دە )، ئەگەر کارەکە دارێژراو یان لێکدراو بێت ئەوا جێناوی لکاوی بەرکار دەچێتە سەر بەشی یەکەمی کارەکە.**

**٣- لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕدا جێناوە کەسییە لکاوەکان دەبنە بەرکار لە دوو شێوەدا:-**

**ئـ- دەگونجێت جێناوە کەسییە لکاوەکانی ( م ــ مان ، ت ــ تان ، ی ــ یان ) ببنە بەرکار، ئەگەر کارەکە سادەبێت جێناوەکان دەچنە نێوان کارو جێناوی**

**لکاوی بکەر، بەڵام ئەگەر کارەکە دارێژراو یان لێکدراو بێت، جێناوەکان دەچنە دوای بەشی یەکەمی کار واتە ( سەر بەشی یەکەمی کار )ەکە.**

**ب- دەگونجێت جێناوە کەسییە لکاوەکان ( م ــ ین ، یت ــ ن ،Ø ــ ن ) ببنە بەرکار، ئەگەر کارەکە سادە بێت جێناوەکان دەچنە دوای جێناوی لکاوی بکەر ئەگەر بکەری ڕستە کەسی یەکەم یا دووەمی تاك و کۆ، بێت خۆ ئەگەر بکەری ڕستەکە کەسی سێیەمی تاك یان کۆ بێت، ئەوا جێناوی لکاوی بەرکار پێش جێناوی لکاوی بکەر دەکەوێت، بەڵام ئەگەر کارەکە دارێژراو یان لێکدراو بێت، جێناوەکان دەچنە کۆتایی کارەکەوە.**

تێبینی (١): جێناوی کەسی لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاك لە دەوری بەرکاردا لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕ دەرناکەوێت

تێبینی(٢): لە کرمانجی ژووروودا کۆمەڵە جێناوی (م، ین، یت ، ن، (Ø)،ن) دەبنە بەرکار لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕ، وەك:-

| | |
|---|---|
| ئازادی ئەز دیتم* | ئازادی ئەم دیتین |
| ئازادی تو دیتیت | ئازادی هوین دیتن |
| ئازادی ئەو دیت | ئازادی ئەو دیتن |

* واتە (ئازاد منی دیت)

## ڕاهێنان (١)

کەی ئەم جێناوە کەسییە لکاوانە دەبنە بەرکار لەڕستەدا، بەنموونەوە نیشانی بدە (ن ، یت ، یان ، ت).

## ڕاهێنان (٢)

جێناوی کەسیی لکاو (تان ، ین) لە دوو ڕستەدا بەکار بهێنە، لە ڕستەی یەکەمدا (تان) بکەر بێت، (ین) بەرکار بێت، لە ڕستەی دووەمدا (ین) بکەر بێت و (تان) بەرکاربێت.

## ڕاهێنان (٣)

کەی جێناوی کەسیی لکاو (ی) بۆ کەسی سێیەمی تاك لە دەوری بەرکاردا دەردەکەوێت؟ بە نموونە ڕوونی بکەرەوە.

## ڕاهێنان (٤)

چۆن جێناوە کەسییە لکاوەکان لەگەڵ ئەم کارانە دەبنە بەرکار؟

(ڕاسپارد ، ببینە ، هێنا ، دەبات)

## ڕاهێنان (٥)

لە ڕستەی (پار هەڵی بژاردین)

١- (ین) چییە و ئەرکی چییە؟ بۆچی خراوەتە ئەو شوێنە؟

٢- ئەگەر (ین) بگۆڕین بۆ (مان) دەکەوێتە کوێ؟ بۆچی؟

٣- ڕستەکە بگۆڕە بۆ کاتی ڕانەبردوو، هەردوو جێناوە لکاوەکانیش شیبکەوە.

## سێیەم: وەکو تەواوکەری بەیاریدە

١/ ئـ– نامەکەم بۆ هات (دێت). (م – مان ، ت – تان ، ی – یان)

بۆم هات.

پارەکەت لێ کەوت (دەکەوێت).

لێت دەکەوێت.

هەواڵەکەیان پێ گەیشت (دەگات).

پێیان گەیشت.

ب– کارەکەم بۆ تەواوکرا (دەکرێت).

بۆم تەواوکرا.

دەفتەرەکەت لێ ستێنرا (دەستێنرێت).

لێت ستێنرا.

پ– گوندەکانیان بۆ ئاوەدان دەکەنەوە.

بۆیان ئاوەدان دەکەنەوە.

کارەکەت پێ دەسپێرێت.

پێت دەسپێرێت.

وانەکەمان تێ دەگەیەنێت.

تێمان دەگەیەنێت.

٢/ ئـ– دارشتنەکەم بۆ بخوێنەوە. (م – مان ، ( – ، – ) ، ی – یان)

بۆم بخوێنەوە.

هەواڵەکەیان پێ بڵێ.

پێیان بڵێ.

ب– پێیان بگەن.

تێیان بگەن.

٣/ ئـ– پرسیارەکانی بۆم چاپکرد. (م – مان ، ت – تان ، ی – یان)

بۆمی چاپکرد.

ب– پرسیارەکانی بۆ چاپکردم. (م – ین ، یت – ن ، (Ø) – ن)

بۆی چاپکردم

پێشتر ئەوەمان زانیوە، کە تەواوکەری بەیاریدە ئەو ناوەیە، یان جێناوەیە، کە لە ڕستەدا واتای کار تەواودەکات بەیارمەتی ئامرازی پەیوەندی، لەگەڵ کاری تێنەپەڕو تێپەڕدا دێت.

لێرە دەمانەوێت بزانین، کە جێناوی کەسیی لکاو چۆن دەبێتە تەواوکەری بەیاریدە؟

لە وەڵامدا دەڵێین جێناوی کەسیی لکاو دەتوانێت ببێت بە تەواوکەری بەیاریدەو بەپێی جۆرو کاتی کاری ڕستەکە لە چەند شێوەیەکی جیاوازدا دەردەکەون:

١– ئەگەر کاری ڕستەکە، کارێکی تێنەپەڕی (ڕابردوو ، یان ڕانەبردوو)ی سادە، دارێژراو یان لێکدراوبێت. بکەری کارەکە لە ناو ڕستەکەدا باس کرابێت، ئەوا کۆمەڵە جێناوی کەسیی لکاو لە کۆمەڵەی ( م – مان ، ت – تان ، ی – یان) لە دەوری تەواوکەری بەیاریدەدا دەچنە دوای ئەو ناوەی کە بکەری ڕستەکەیە، وەکو لە ڕستەکانی ژمارە (١) لقی (ئـ) نیشاندراون، وەکو دەبینین لە ڕستەی (نامەکەم بۆ هات)دا وشەی (نامەکە) بکەری ڕستەکەیە، (بۆ) ئامرازی پەیوەندییە و جێناوی کەسیی لکاوی (م) لە دوای وشەی (نامەکە)وە هاتووەو تەواوکەری بەیاریدەی کارەکەیەو دەتوانین لە بری

جیناوی کەسیی لکاوی (م) هەموو جێناوە کەسییە لکاوەکانی (مان، ت — تان، ی — یان) بەکاربهێنن، بەڵام ئەگەر وشەی (نامەکە) لاببەین ئەوا جێناوی کەسی لکاوی تەواوکەری بەیاریدە دەچێتە سەر ئامرازە پەیوەندییەکە. بەڵام ئەگەر سەیری ڕستەکانی لقی (ب) بکەین دەبینین کاری (تەواوکرا ، ستێنرا) ڕابردووی بکەر نادیارن (کارا نادیارن)و کاری (تەواودەکرێت ، دەستێنرێت) ڕانەبردووی بکەرنادیارن و لەگەڵ ئەم کارانەدا جێناوە کەسییە لکاوەکانی کۆمەڵەی ( م — مان ، ت — تان ، ی — یان ) دەبنە تەواوکەری بەیاریدەو لە دوای (جێگری بکەر) [١] ەکانەوە هاتوون، لەگەڵ بوونی ئامرازی پەیوەندی (بۆ — لێ) لە ڕستەکاندا، بەڵام ئەگەر جێگری بکەرەکان لە ڕستەکاندا لاببرێت، ئەوا جێناوە کەسییە لکاوەکانی دەوری تەواوکەری بەیاریدە دەچنە دوای ئامرازە پەیوەندییەکەوە، ئەگەر کاری ڕستەکە، کارێکی (ڕانەبردووی تێپەڕ)ی سادە، دارێژراو یان لێکدراو بێت و بەرکار لەڕستەکەدا باسکرابێت، ئەوا جێناوە کەسییە لکاوەکانی کۆمەڵەی (م — مان ، ت — تان، ی — یان ) دەبنە تەواوکەری بەیاریدەو دەچنە دوای بەرکارەکە، بەڵام ئەگەر بەرکار لابرا ئەوا جێناوە کەسییە لکاوەکان دەچنە سەر ئامرازە پەیوەندییەکە[٢] هەروەکو لە ڕستەکانی لقی (پ) نیشاندراون.

٢— ئەگەر کاری ڕستەکە (داخوازی تێپەڕ) بێت و بەرکار لە ڕستەکەدا باسکرابێت ئەوا جێناوە کەسییە لکاوەکان ( م — مان ، ی — یان) دەبنە

---

(١) جێگری بکەر = (نائب فاعل)

(٢) هەندێ جار ئامرازو جێناوی لکاوی تەواوکەری بەیاریدە دەکەونە دوای کارەکەوە بەتایبەتی لە کاتی ئاخاوتن دا: دەی نێرێت بۆم.

تەواوکەری بەیاریدەو لە دوای بەرکارەکەوە دێن. بەڵام ئەگەر بەرکار لابرا، ئەوا جێناوە کەسییە لکاوەکان دەچنە دوای ئامرازە پەیوەندییەکەوە وەکو لە ڕستەکانی ژمارە (٢) لقی (ئـ) نیشاندراون.

خۆ ئەگەر کاری ڕستەکە (داخوازی تێنەپەڕ) بێت، ئەوا جێناوی لکاوی تەواوکەری بەیاریدە هەمیشە لە دوای ئامرازە پەیوەندیەکە دێت، وەکو لە ڕستەکانی لقی (ب) نیشاندراوە.

٣- ئەگەر کاری ڕستەکە (ڕابردووی تێپەڕ)ی سادە دارێژراو یان لێکدراو بێت، ئەوا ئەو جێناوە کەسییە لکاوانەی کە دەبنە تەواوکەری بەیاریدە، لە دوو شێوەی جیاوازدا دەردەکەون:

ئـ- کۆمەڵە جێناوی کەسیی لکاوی کۆمەڵەی (م ــ مان ، ت ــ تان ، ی ــ یان) دەبنە تەواوکەری بەیاریدەو یەکسەر لە دوای ئامرازی پەیوەندییەوە دێن، بەڵام ئەگەر بەرکاری ڕستەکە لابرا، ئەوا جێناوی کەسیی لکاوی بکەر دوای جێناوی لکاوی تەواوکەری بەیاریدەوە دێت هەروەکو لە ڕستەکانی ژمارە (٣) لقی (ئـ) نیشاندراون.

ب: کۆمەڵە جێناوی کەسیی لکاو (م ــ ین ، یت ــ ن (Ø) ‒ ن) دەبن بە تەواوکەری بەیاریدەو دەکەونە کۆتایی کارەوە وەکو لە نموونەکانی لقی (ب) نیشاندراوە، بەڵام ئەگەر بەرکار لابرا، ئەوا جێناوی کەسیی لکاوی بکەر لە دوای ئامرازی پەیوەندییەوە دێت، وەك لە ڕستەی (بۆی چاپکردم) دا دیارە.

هەروەها دەبێت ئاماژە بەوە بکەین، کە ئەگەر کاری ڕستەکە ڕانەبردووی تێپەڕ بوو، بەرکاری ڕستەکە ناوێك یان جێناوێك یان هاوەڵناوێك بوو بە دیارخەری، ئەوا جێناوی کەسیی لکاوی تەواوکەری بەیاریدە دەچێتە دوای

دیارخـــەرەکانی بەرکارەکـــەوە، وەکـــو لـــە ڕســـتەی (پەرتووکەکـــەتانم لێ وەردەگرێت) دا دەرکەوتووە.

**بەکورتی:**

**جێناوە کەسییە لکاوەکان دەبنە تەواوکەری بەیاریدە لە ڕستەدا بەم شێوەیەی خوارەوە:**

**١- لەگەڵ کاری تێنە پەڕی دەمی ( ڕابردوو ، ڕانەبردوو ) و هەروەها کاری بکەر نادیار کۆمەڵە جێناوی کەسیی لکاوی ( م ـ مان ، ت ـ تان ، ی ـ یان ) دەبنە تەواوکەری بەیاریدەو لە دوای بکەر یان جێگری بکەر دێن، ئەگەر بکەر یان جێگری بکەر لابرێن، جێناوەکان دەچنە دوای ئامرازە پەیوەندییەکە.**

**لەگەڵ کاری (ڕانەبردووی تێپەڕیشدا) کۆمەڵە جێناوی کەسیی لکاو (م ـ مان، ت ـ تان ، ی ـ یان) لە دەوری تەواوکەری بەیاریدە دەچنە دوای بەرکاری ڕستەکە ئەگەر لە ڕستەکەدا هەبوو، بەڵام ئەگەر بەرکار لابرێت، جێناوەکان دەچنە دوای ئامرازی پەیوەندی.**

**٢- لەگەڵ کاری (داخوازی) کۆمەڵە جێناوی کەسیی لکاوی ( م ـ مان ، ی ـ یان ) دەبنە تەواوکەری بەیاریدە و لە دوای بەرکارەوە دێن، ئەگەر کارەکە تێپەڕ بێت و بەرکار باسکرابێت، بەڵام ئەگەر بەرکار لابرا ئەوا جێناوەکان دەچنە دوای ئامرازی پەیوەندی، بەڵام ئەگەر کارەکە تێنە پەڕ بێت ئەوا جێناوەکان هەمیشە دەچنە دوای ئامرازە پەیوەندییەکە.**

**٣- لەگەڵ کاری ( ڕابردووی تێپەڕ)دا، جێناوە کەسییە لکاوەکان دەبنە تەواوکەری بەیاریدە لە دوو شێوەدا :**

**ئـ/ دەگو نجێت کۆمەڵە جێناوی کەسیی لکاو ( م ـ مان ، ت ـ تـان ، ی ـ یـان ) ببنە تەواوکەری بەیاریدەو یەکسەر لە دوای ئامرازە پەیوەندییەکەوە دێن.**

**ب/ دەگو نجێت کۆمەڵە جێناوی کەسیی لکاوی ( م ـ ین ، یت ـ ن ، Ø ـ ن ) ببنە تەواوکەری بەیاریدەو دەچنە کۆتـایی کـارەکـە، هـەروەها لـەم دەمـەی کاردا جێناوی کەسیی لکـاو بـۆ کەسـی سێیەمی تـاك لـە دەوری تەواوکـەری بەیاریدەدا دەرناکەوێت[1].**

---

(١) جێناوی کەسیی لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاك لە دەوری تەواوکەری بەیاریـدە دەرناکـەوێت لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕدا ئەگەر کۆمەڵەی دووەمی جێناوە لکاوەکانی وەرگرتبێت.

## ڕاهێنان (١)

ئەم جێناوە کەسییە لکاوانەی خوارەوە لەگەڵ چ کارێکدا دەبنە تەواوکەری بەیاریدە؟ بە نموونە نیشانی بدە.

(ین ، یان ، یت ، مان ، ن)

## ڕاهێنان (٢)

کەی جێناوی لکاو وەکو تەواوکەری بەیاریدە لە رستەدا دەرناکەوێت؟ بەنموونە بیسەلمێنە.

## ڕاهێنان (٣)

بۆت نوسیوم بۆت بنووسم ئەمن چیـــم

دوندی قەندیلی گۆڕەپانی هەڵگورد نیم

١- لە نیوەی دێری یەکەم دووجار جێناوی (ت) هاتووە، هەریەکەیان ئەرکیان چی یە؟

٢- (م) ی دوای (نووسی) و دوای(بنووسم) ئەرکیان چییە؟

## ڕاهێنان (٤)

چۆن جێناوە کەسییە لکاوەکان لەگەڵ ئەم کارانەی خوارەوەدا دەبنە تەواوکەری بەیاریدە؟

(لەبەربکە ، پێ گەیشت ، تێ گەیاند ، لێ وەرگرت)

## ڕاهێنان(٥)

لە ڕستەی (وڵاتەکەیان لێ دابەشکردین).

١- (ین) چییە ؟ بۆچی خراوەتە ئەو شوێنە؟

٢- (لێ) شیبکەوە.

٣- ئەگەر(ین) بگۆڕین بۆ جێناوی (مان) دەچێتە کوێ؟ بۆچی؟

٤- ئەگەر ناوی (وڵاتەکە) لاببەین (یان) دەچێتە کوێ؟

## هاوەڵناو لەڕووی بنچینەی وشەکانییەوە ( ڕۆنان )ەوە

**هاوەڵناو لە ڕووی چۆنیەنی دروستبوونی وشەکانییەوە واتە پێکهاتنەوە، دوو جۆرە:-**

ئـ- هاوەڵناوی سادە.

ب- هاوەڵناوی ناسادە.

### ئـ- هاوەڵناوی سادە:

١- بۆ ڕۆژی نەورۆز سێ چەپك

لە نێرگس و گوڵی ناسك

ئەکەم بە دیارییەکی جوان

بۆ گەلی کوردی قارەمان

٢- هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە

سەرپۆش فڕێدە چ وادەی شەرمە

٣- ئێمەی ئازا لە دوژمن ناترسین

٤- بابێ دارای هەژارە،لێ دل و دەروونێ وی دەوڵەمەندن.

٥- دارا هشك سێبەرێ ناکەت.

هاوەڵناو، وشەیەکە دەبێتە دیارخەری ناوێك یان جێناوێك یان هاوەڵناوێکی تر یان تەواو کەری کارێکی ناتەواو ، واتە سیفەتێك ئاشکرا دەکاتو لە هاوچەشنەکانی جیا دەکرێتەوە.

هاوەڵناویش بە پێی چۆنیەتی دروستبوونی بنچینەی وشەکەوە دەکرێت بەچەند بەشێك، لێرەدا باسی هاوەڵناوی سادە دەکەین.

لە نموونەی ژمارە (١)دا، هەریەك لەوشەی (ناسك، جوان، قارەمان) هاوەڵناونو لەوشەیەکی واتاداری سەربەخۆ پێکهاتوون هیچ پێشگرو پاشگرێکیان لەگەڵدا نییەو بەهۆی (ی) ئامرازی خستنە سەر بوونەتە

دیارخەری وشەکانی (گوڵ، دیارییەك، کورد)و وەسفی ئەو ناوانەی کردووەو لەناو هاو ڕەگەزەکانی جێگایان کردووەتەوە.

لە نموونەی ژمارەدا (٢)دا، وشەی (گەرم) هاوەڵناوە و لە وشەیەکی واتاداری سەربەخۆ پێك هاتوون و بووە بە تەواوکەری کاری ناتەواو(ە).

لە ڕستەی ژمارە (٣) دا، وشەی (ئازا) هاوەڵناوەو لە وشەیەکی واتاداری سەربەخۆ پێکهاتووەو بەهۆی (ی) ئامرازی خستنەسەر بووە بە دیارخەری جێناوی کەسی (ئێمە).

هەروەها لە ڕستەکانی ژمارە (٤،٥)دا، وشەکانی (هەژار، هشك) هاوەڵناوی سادەن و لە وشەیەکی واتادار پێکهاتوون و بوونەتە دیارخەری ناو و تەواوکەری کاری ناتەواو.

## ب- هاوەڵناوی ناسادە:

هاوەڵناوی ناسادە دوو جۆرە:

### ١- هاوەڵناوی دارێژراو:

ئ- کرێکاری یەکەم کاری خۆی تەواو کرد.

ب- تا ئێستا پیاوی بەجەرگی وام نەدیوە.

پ- ڕێوییەکی گەڕۆك لە شێرەکی نووستی چێترە.

ت- گیاندارو نەبوو دیارو نەدیار
زاناو نەزانو گێل وشیار

ج- نوسەری بەتوانا هەمیشە لە بەرهەمەکانیدا جۆرە تایبەتێتی و شێوەیەکی دیاری پێوە دەبێت.

ئەگەر سەیری وشەکانی (یەکەم، بەجەرگ، گەڕۆك، نووستی، دیار، نەدیار، زانا، نەزان، وشیار، بەتوانا) بکەین،دەبینین کە هەموویان هاوەڵناوی

دارِێژراون هەریەك بە شێوەیەك دروست كراوە، لێرەشدا چەند یاسایەكی
دروستكردنی هاوەڵناوی دارِێژراو دەخەینە ڕوو.

| ١-(ئـ) هاوەڵناوی سادە | پاشگر | هاوەڵناوی دارِێژراو |
|---|---|---|
| یەك | ەم | یەكەم |
| ڕوون | اك | ڕووناك |
| نەرم | ان | نەرمان |
| ڕەق | ەن | ڕەقەن |

| (ب) پێشگر | هاوەڵناوی سادە | هاوەڵناوی دارِێژراو |
|---|---|---|
| نە | خۆش | نەخۆش |
| نا | ڕاست | نا ڕاست |

| ٢ -(ئـ) ناوی سادە | پاشگر | هاوەڵناوی دارِێژراو |
|---|---|---|
| ژن | انە، انی | ژنانە، ژنانی |
| زێڕ | ین | زێڕین |
| مەلە | وان، ڤان | مەلەوان - مەلەڤان |
| برین | دار | بریندار |
| گۆشت | ن | گۆشتن |
| ڕاو | چی | ڕاوچی |
| دەشت | ەكی | دەشتەكی |
| بەخت | یار، ەوەر | بەختیار، بەختەوەر |
| ئاسن | گەر | ئاسنگەر |

| ٢- (ب)پێشگر | ناوی سادە | هاوەڵناوی داڕێژراو |
|---|---|---|
| بە | تام | بەتام |
| ب/بە | جەرگ | ب جەرگ/ بەجەرگ |
| بێ | شەرم | بێ شەرم |

| ٣- (ئـ) چاوگ | ڕەگی کار | پاشگر | هاوەڵناوی داڕێژراو |
|---|---|---|---|
| نووسین | نووس | ەر | نووسەر |
| گەڕان | گەڕێ | ۆك، یدە | گەڕۆك، گەڕیدە[1] |
| ترسان | ترس | نۆك، ناك | ترسنۆك، ترسناك |
| فرۆشتن | فرۆش | یار | فرۆشیار |
| زانین | زان | ا | زانا |

| (ب) چاوگ | پێشگر | ڕەگی کار | هاوەڵناوی داڕێژراو |
|---|---|---|---|
| گۆڕین | نە | گۆڕ | نەگۆڕ |
| مردن | نە | مر | نەمر |
| بەزین | نە | بەز | نەبەز |

| (پـ) پێشگر | ڕەگی کار | پاشگر | هاوەڵناوی داڕێژراو |
|---|---|---|---|
| نا | بین | ا | نابینا |
| نە | زێ | ۆك | نەزۆك |
| بـ | خۆ | ەر | بخۆر |

---

(١) : ناکرێ پیتە بزوێنی (ێ) لەگەڵ بزوێنی (ۆ) لە (ۆك) و (یـ) لە (یدە) بەیەکەوە بێن، بۆیێ شوێنی خۆی بەردەدا بۆ (ۆ) و (یـ).

٤-

| چاوگ | قەدی چاوگ | پاشگر | هاوەڵناوی دارێژراو |
| --- | --- | --- | --- |
| کەوتن | کەوت | وو | کەوتوو[١] |
| شکان | شکا | و | شکاو |
| سوتان | سوتا | و | سوتاو |
| ڕزین | ڕزیـ | و | ڕزیو |
| بردن | برد | ە | بردە |
| کەوتن | کەوت | ە | کەوتە |

## ٢- هاوەڵناوی لێکدراو:

چەند یاسایەکی دروستکردنی هاوەڵناوی لێکدراو

١- ناو + ناو

چاو + باز ⟵ چاو باز.

بەژن + چنار ⟵ بەژن چنار.

٢- ناو + ئامراز + ناو

دەست + بە + سەر = دەست بەسەر.

گوڵ + بە + دەم = گوڵ بەدەم.

٣- دوبارە کردنی ناوێك

ڕێ ڕێ ، چین چین ، پارچە پارچە.

---

(١) لە کرمانجی ژوورودا پاشگری (ی) دەخرێتە سەر قەدی چاووگ و هاوەڵناوی دارێژراوی لێ دروست دەبێت:

کەفت + ی = کەفتی

شکەست + ی = شکەستی

سۆت + ی = سۆتی

شویشت + ی = شویشتی

- دلێ سۆتی ب ئاڤ ترشکا ناکەویت.

- مرۆڤێ مریو زیندی ب ئاڤێ پاقژ دبن.

**٤– هاوەڵناوی ژمارە + ناو**

دوو + دڵ ⟵ دوو دڵ.

حەوت + ڕەنگ ⟵ حەو ترەنگ.

**٥– ناو + هاوەڵناو**

دڵ + خۆش ⟵ دڵخۆش.

چاو + شین ⟵ چاو شین.

**٦– هاوەڵناو+ ئامراز + هاوەڵناو**

بۆر + ە + دەوڵەمەند ⟵ بۆرە دەوڵەمەند.

پاك + و + خاوێن ⟵ پاكو خاوێن.

**٧– هاوەڵناو+ ئامراز + ناو**

شۆڕ + ە + ژن = شۆڕە ژن

گێل + ە + پیاو = گێلە پیاو

**٨– ناو + ڕەگی كار**

خێر + خواز = خێر خواز

پیاو + كوژ = پیاو كوژ

قورئان + خوێن = قورئان خوێن

ڕۆژنامە + نووس = ڕۆژنامەنووس

**٩ – هاوەڵناو+ ڕەگی كار**

ڕاست + بێژ ⟵ ڕاستبێژ

گەش + بین ⟵ گەشبین

ڕەش + پۆش ⟵ ڕەشپۆش

خۆش + نووس ⟵ خۆشنووس

١٠– هاوەڵناو + هاوەڵناو

رەش + ئەسمەر ⟵ رەش ئەسمەر

تازە + پێگەیشتوو ⟵ تازە پێگەیشتوو

١١– ناو + هاوەڵناوێکی کراو

دڵ + سوتاو ⟵ دڵسوتاو

جەرگ + بڕاو ⟵ جەرگبڕاو

١٢– بە دووبارە بوونەوەی هاوەڵناوێکی سادە

خۆش خۆش ، جوان جوان ، سوور سوور.

١٣– هاوەڵکار + ناو = ⟵ ژێر دەست ، ژێر چەپۆك.

١٤– ناو + ڕەگی کار + پاشگر ⟵

خەبات + کە + ەر ، ڕەنج + دە + ەر ، جل + شۆ+ ەر ، ڕاو +کە+ەر

**بەکورتی:**

**هاوەڵناولە ڕووی ڕۆنانەوە دوو جۆرە:**

**١- هاوەڵناوی سادە: ئەو هاوەڵناوەیە، کە لە وشەیەکی سادەی واتاداری سەربەخۆی تەواو پێکدێت.**

**٢- هاوەڵناوی ناسادە:**

**هاوەڵناوی ناسادەش دوو جۆرە:**

**ئـ- هاوەڵناوی داڕێژراو : ئەو هاوەڵناوەیە، کە لە وشەیەکی سادەو پێشگرێك یان پاشگرێك یان هەردووکیان پێکدێت.**

**ب- هاوەڵناوی لێکدراو : ئەو هاوەڵناوەیە، کە لە دوو وشەی واتادار یان پتر پێکهاتووە.**

## ڕاهێنان(١)

١- چۆن هاوەڵناوێکی داڕێژراو، لە هاوەڵناوێکی لێکدراو جیا دەکەینەوە؟ بە نموونە ڕوونی بکەرەوە.

٢- بەچەند ڕێگا هاوەڵناوی داڕێژراو لە ڕەگی کار دروست دەکرێت؟ بەنموونە ڕوونی بکەوە.

٣- چۆن دەتوانین لە قەدی چاوگی تێنەپەڕەوە، هاوەڵناوی داڕێژراو دروست بکەین؟

٤- چۆن لە دوو ناو، هاوەڵناوی لێکدراو دروست دەکەیت ؟ نموونەی بۆ بهێنەوە:

## ڕاهێنان (٢)

جۆرو شێوەی دروستبوونی ئەم هاوەڵناوانەی خوارەوە دیاری بکە.

دەنگبێژ، سەرسپی، ڕاستگۆ، کەوتوو، نەمر، خەباتکەر، تێکۆشەر، ناشاد.

## ڕاهێنان (٣)

لە چاوگی (زانین - کوشتن) هاوەڵناوی داڕژاو دروست بکە:

جارێك بە پێشگر و جارێك بە پاشگر، پاشان هەریەکەیان لە ڕستەبەکاربهێنە.

## ڕاهێنان (٤)

لەم ڕستانەی خوارەوە هاوەڵناوەکان دەربهێنە و جۆرەکانیان دەست نیشان بکە لەڕووی بنچینەی وشەکانیان.

١- مرۆڤی راستگۆ درۆ ناکات.

٢- پێشمەرگە بەجەرگە.

٣- کچێکی نووسەریان خەڵاتکرد.

٤- ئەدیسۆنی زانا خزمەتی مرۆڤایەتی کردووە.

## جۆرەكانی هاوەڵكار

## لە ڕووی پێكهاتنیانەوە ( ڕۆنان )ەوە

ئـ:

١- هێزی گەل لەشكری دوژمنی خێرا لەناوبرد.

٢- بەفر لە كوردستان زۆر دەبارێت.

٣- دایكی ڕۆشنبیر منداڵ باش پەروەردە دەكات.

٤- گەلی كورد لە بەهاری ساڵی (١٩٩١)دا گورج ڕاپەڕی.

ب:

١- بەشەو سەردانی هاوڕێكەمان كرد.

٢- پێشمەرگەكان دلێرانە بەرگری لە كوردستان دەكەن.

٣- ئەوان لە دوور هاتبوون.

٤- وتارەكەی بەجوانی خوێندەوە.

پ:

١- كوردستانمان پڕ بەدڵ خۆش دەوێت.

٢- لاوەكان دەستە دەستە دەهاتن.

٣- منداڵەكە لەپاو لەپ كەوت.

٤- گەڕەكەكەیان ماڵ بەماڵ بەسەر كردەوە.

پێشتر ئەوەمان خوێندووە، كە هاوەڵكار وەڵامی پرسیاری (چۆن ، لەكوێ ، كەی ، چەندی ......)ی لایەنێكی ڕوودانی كار دەداتەوە و وەسفی كارەكە دەكات و سنوورێك بۆ ڕوودانی كارەكە لە ڕستەدا دیاردەخات.

ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (ئـ) بکەین، دەبینین وشەکانی (خێرا ، زۆر ، باش ، گورج) هەموویان هاوەڵکارن و هەریەکەیان لە ڕستەی خوێدا وەسفی کاری ڕستەیەکی کردووە، هەموویان لە ڕووی پێکهاتنەوە سادەن.

لە ڕستەکانی بەشی (ب) وشەکانی (بەشەو ، دلێرانە ، لەدوور ، بەجوانی) هەموویان هاوەڵکاری داڕێژراون، هەریەکەیان لەڕستەی خۆیدا وەسفی کاری ڕستەکەی کردووە.

لەڕستەکانی بەشی (پ) وشەکانی (پڕ بەدڵ ، دەستە دەستە ، لەپاو لەپ ، ماڵ بە ماڵ) هەموویان هاوەڵکاری لێکدراون، هەریەکەیان لە ڕستەی خۆیدا وەسفی کاری ڕستەکەی کردووە.

ئینجا لێرەدا دەمانەوێت بزانین، کە هاوەڵکار لە ڕووی پێکهاتن و دروست کردنەوە چەند جۆرە؟ هەر جۆرەی چۆن و لەچی پێکدێت؟ لەوەڵامدا دەڵێین هاوەڵکار لەڕووی پێکهاتنیەوە دەکرێت بە دوو جۆر، بەم شێوەیەی خوارەوە:—

**ئـ- هاوەڵکاری سادە.**　　　　**ب- هاوەڵکاری ناسادە**

**ئـ/ هاوەڵکاری سادە:** ئەو هاوەڵکارەیە کە لە بنەڕەتدا لەیەك وشەی واتاداری سەربەخۆ پێکهاتووەو لە ڕستەدا وەسفی کار دەکات.

(خێرا ، زۆر ، باش ، گورج ، پار ، کەم ، دوور ، نزیك ، خراپ ، فرە ، زوو ، درەنگ ، سەر ، ژێر ، تەنیشت .......).

**ب/ هاوەڵکاری ناسادە:** ئەمیش دوو جۆرە:

١- هاوەڵکاری داڕێژراو: ئەو هاوەڵکارەیە کە لە وشەیەکی واتادار لەگەڵ پێشگرێك یان پاشگرێك یان لەگەڵ هەردووکیان پێکدێت وەکو:

هەندێك لە ڕێگاكانی دروستكردنی هاوەڵكاری داڕژاو

١- پێشگر (بە) + ناو

(بەناز ، بەدڵ، بەگیان، بەشەو، بەزستان، بەساڵ........)

٢- پێشگر + هاوەڵكار

(بەزۆر، لەدوور، لەتەنیشت، لەنزیك........)

٣- ناو+پاشگری (انە)

(ڕۆژانە، شێرانە، مندالآنە، سالآنە.......)

٤- هاوەڵناو+ پاشگری(انە)

مەردانە، دلێرانە،هێمنانە، ئازایانە، ژیرانە......)

٥- پێشگر + هاوەڵناو+ پاشگر

(بەجوانی، بەباشی، بەخۆشی، بەساردی، بەهێمنی، بەگەرمی......)

٦- پێشگر + ناو + پاشگر

(بەسواری ، بەهاوینێ، بێ شەرمانە، بێ باكانە، بەكوردایەتی...)

**٢- هاوەڵكاری لێكدراو :** ئەو هاوەڵكارەیە كەلەدوو وشەی واتادار یان پتر پێكدێت.

**هەندێك لە ڕێگاكانی دروستكردنی هاوەڵكاری لێكدراو:**

١- بەدووبارەكردنەوەی ناو یان هاوەڵناویان هاوەڵناوی ژمارە

( نم نم ، دەستە دەستە، پۆل پۆل.......)

( جوان جوان ، هێدی هێدی ، وردە وردە......)

(یەك یەك ، چوار چوار، دوو دوو.........)

٢– ناو + ئامرازی(به) + ناو

(ڕوو به ڕوو، ماڵ به ماڵ ، دێ به دێ، شار بەشار......)

٣– ناو + ئامرازی (او) + ناو

(سەراوسەر، دەماو دەم ، دۆڵاودۆڵ، پشتاوپشت.......)

٤– هاوەڵناو+ ئامرازی (و) + هاوەڵناو

تێر و پڕ ، کزومات، پاکوخاوێن، کزومەلوول......)

٥– هاوەڵناو+ ئامرازی (به) + ناو

(پڕبەدڵ، پڕبەدەم ، پڕبەدەنگ.......)

٦– پێشگر + هاوەڵناوی لێکدراو + پاشگر

(بەسەربەرزی، بەڕووخۆشی ، بەدڵخۆشی ، بەدڵشکاوی.....)

٧– هاوەڵناوی نیشانە + ناو

(ئەمشەو ، ئەمڕۆ ، ئەوساڵ، ئەوسا......)

٨– هاوەڵکار + هاوەڵناوی ژمارە + ناو

(پاش نیوەڕۆ ، پێش نیوەڕۆ ، دوای نیوەڕۆ، دوای نیوەشەو، پێش دوو ڕۆژ)

## ڕاهێنان (١)

جۆرو شێوەی دروستکردنی ئەم هاوەڵکارانەی خوارەوە دەربخە.

(ئەمڕۆ ، بەگوڕ ، تاقم تاقم ، بەدۆستایەتی ، منداڵانە.....)

## ڕاهێنان (٢)

لەم دێڕە هۆنراوانەی خوارەوە هاوەڵکارەکان دەربهێنە و جۆرەکانیان دیاربخە.

١- کوردێکم دەوێ چاپوك و پتەو
سەفەرێك هەیە بۆم بکا بەشەو.

٢- زمانم شەق ئەبا یەك دەم ئەگەر بێت و نەبا ناوت
بەکوێری دائەنیشم گەر لەبەر چاوم نەبێ چاوت.

٣- پڕ بەدڵ بانگ دەکەم سەربەستیم دەوێ
کوردستانم جێی شێرانە دەبێ سەرکەوێ

## ڕاهێنان (٣)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شیبکەوە.

١- جوان منداڵە جوانەکەی جوان پەروەردە کردووە.

٢- گەلی کوردستان دلێرانە ڕاپەڕی.

## ڕاهێنانی(٤)

وشەی (خراپ،منداڵانە) لە دوو ڕستەدا بەکاربهێنە، بەمەرجێك جارێك ببێتە هاوەڵناو و جارێکی تریش ببێتە هاوەڵکار.

## ڕادە

١- ڕادەو هاوەڵناو:

٢- ڕادەو هاوەڵکار:

١- پەڕتووکێکی کۆنم، بۆ هاوڕێکەم نارد.

پەڕتووکێکی زۆر کۆنم، بۆ هاوڕێکەم نارد.

٢- فاکسەکەم بەپەلە بۆ هاوڕێکەم نارد.

فاکسەکەم زۆر بە پەلە بۆ هاوڕێکەم نارد.

٣- قوتابییەکە درەنگ هات.

قوتابییەکە هەندێك درەنگ هات.

٤- پیاوەکە دوور ڕۆیشت.

پیاوەکە زۆر دوور ڕۆیشت.

### ڕاڤەکردن:

پێش ئەوەی باسی ڕادەو هاوەڵکار یان ڕادەو هاوەڵناو بکەین پێویستە وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارانە بدەینەوە کە ڕادەی هاوەڵکار یان هاوەڵناو چییە؟

چ هاوەڵکارێك یان هاوەڵناوێك ڕادەکەی دەردەخرێت؟ئەو پەیڤانەی ڕادە پیشان دەدەن کامانەن؟. بە پێویستی دەزانین سەرنج بۆ ئەو ڕاستییە ڕابکێشین کە ئەویش ڕادەو هاوەڵناوە، واتا دەرخستنی ڕادەی هاوەڵناوە بە هاوەڵناوێکی تر، چونکە زۆر وشەی ڕادەی هاوەڵناو لەناو ڕستەدا، ڕادەی هاوەڵکاریش دەردەخەن، جا ئەگەر بمانەوێت ڕادەی هاوەڵناوێك لە ڕستەدا دەربخەین، ئەوا بەهۆی هاوەڵناوی نادیارەوە دەردەخرێت، کە دەکەوێتە

پێش هاوەڵناوە بنجییەکە، هەروەك لە ڕستەی یەکەم و دووەمی ڕیزی ژمارە (١)دا دیارخراوە.

لە ڕستەی یەکەمدا، وشەی (کۆن) هاوەڵناوی چۆنیەتیەو دیارخەری وشەی (پەڕتووکێك)ە، بەهۆی (ی) ئامرازی خستنەسەر پێکهاتووە، بەڵام لە ڕستەی دووەمدا، وشەی (زۆر) بووە بە دیارخەری هاوەڵناوی (کۆن)، (کۆن)یش دیارخراوەو ڕادەی ئەو کۆنییە پیشان دەدات. ئینجا بە هەردووکیان واتا (زۆر کۆن) وەکو گرێیەکی هاوەڵناوی دەبنە دیارخەری وشەی (پەڕتووکێك) کە ناوێکی تاکی نەناسراوی گشتییە.

هەر بەم پێیە دەتوانین لە بری وشەی (زۆر) وشەی (گەلێك ، نەختێك ، کەمێك ، هەندێك ، تۆزێك ، فرە ، پیچێك....) بەکاربهێنین، کە هاوەڵناوی نادیارن.

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەی یەکەم و دووەمی ڕیزی ژمارە (٢)، دەبینین وشەی (زۆر) لە شێوەیەکی جیاوازدا بەکارهاتووە، واتا ئەرکی لەناو ڕستەکەدا، لە ئەرکی وشەی (زۆر)ی ڕستەکانی پێشوو جیاوازە.

لە ڕستەی یەکەمدا، وشەی (بەپەلە) هاوەڵکاری چۆنیەتییەو چۆنیەتی ڕوودانی کاری (نارد) ڕووندەکاتەوە، بەڵام لە ڕستەی دووەمدا، وشەی (زۆر) ڕادەی هاوەڵکارەکە ڕووندەکاتەوەو دیارخەری هاوەڵکاری (بەپەلە)یە، هاوەڵکاری (بەپەلە)ش دیارخراوە بەهەردووکیان وەکو گرێیەکی هاوەڵکاری چۆنیەتی ڕوودانی کارەکە دەردەخەن.

له ڕستەکانی ریزی سێیەمیشدا :

له ڕستەی یەکەمدا وشەی (درەنگ) هاوەڵکاری کاتییەو کاتی ڕوودانی کاری (هات) ڕووندەکاتەوە، بەڵام له ڕستەی دووەمدا وشەی (هەندێك) ڕادەی هاوەڵکارەکە ڕووندەکاتەوەو دیارخەری هاوەڵکاری (درەنگ)ە، هاوەڵکاری (درەنگ)یش دیارخراوە، بە هەردووکیان وەکو گرێیەکی هاوەڵکاری کاتی ڕوودانی کارەکە دەردەخەن.

ڕستەکانی ڕیزی چوارەمیش بەهەمان شێوە ڕووندەکرێنەوە.

هەر بەم پێیە دیسان دەتوانین له بری وشەی (زۆر) وشەکانی (نەختێك ، گەلێك ، کەمێك ، تۆزێك ، هەندێك ، فرە ، پیچێك ....هتد) بەکاربهێنین.

**بەکورتی :-**

**ئ- ئەم هاوەڵناوانە تەنها ڕادەی هاوەڵناوە چۆنیەتییە کە دەردەخەن، کە بریتین لە (زۆر ، هەندێك ، گەلێك ، کەمێك ، تۆزێك ، بڕێك ، فرە ، پیچێك.... هتد)[1] پێیان دەگوترێت (هاوەڵناوی نادیار).**

**ب- ئەم هاوەڵکارانە : ڕادەی هاوەڵکارە چۆنیەتی و کاتی و شوێنییەکان، دەردەخەن کە بریتین لە (زۆر، هەندێك، گەلێك، کەمێك ، تۆزێك، بڕێك، فرە، پیچێك ... هتد) (هاوەڵکاری چەندێتی).**

---

(١) کاتێك کە ڕادەی هاوەڵناویان هاوەڵکارێك دەردەخرێت پێویستی بە (ی) ئامرازی خستنەسەر نییە کە بکەوێتە نێوان ڕادەو هاوەڵناوەکە یان ڕادەو هاوەڵکارەکە.

## ڕاهێنان (١)

بە نموونەوە وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەرەوە:

١- چۆن ڕادەی هاوەڵکار دەردەخەیت؟

٢- جیاوازی لە نێوان هاوەڵکارو هاوەڵناودا چییە؟

## ڕاهێنان (٢)

(کۆشکێکی زۆر گەورەیان، بۆ کرێکارەکان دروستکردووە، ئەم کۆشکە، ئێستا مەڵبەندی یەکێتی سەندیکای کرێکارانە، کرێکارەکانیش بە دڵسۆزی لە کاتی دروستکردنیدا ئیشیان تیا دەکرد، بۆ ئەوەی زۆر زوو بینای کۆشکەکە تەواوبکەن).

١- وشەی (زۆر) لە پارچە نووسراوەکە، دووجار هاتووە بە وردی شییانبکەرەوە.

٢- ئەو هاوەڵکارانەی، کە هێلیان بەژێردا هاتووە واتای چ کارێک دەردەخەن، کارەکان دەستنیشان بکە.

## ڕاهێنان (٣)

**شیکردنەوە**

نامیلکەکەم زۆر باش خوێندەوە.

نامیلکەکە: ناوە ، گشتییە ، ناسراوە ، بەرکارە.

م: جێناوی لکاوە بۆ کەسی یەکەمی تاك ، بکەرە .

زۆر: ڕادەی هاوەڵکاری چەندییە دیارخەری (باش)ە.

باش: هاوەڵکاری چۆنیەتییە دیارخراوە.

زۆربــاش: گرێیــەکی هاوەڵکارییــە ، تەواوکــەری کــاری ڕســتەکەیە کــاری (خوێندەوە) دەردەخات.

خوێندەوە: ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندنە ، تێپەڕە ، داڕێژراوە ، ئەرێیە.

لەم ڕستانەدا وشە هێڵ بەژێر داهاتووەکان شیبکەرەوە.

١- خانی لەپ زێڕین قەڵایەکی گەلێك سەختی دروستکرد.

٢- مێژووی قەڵای دمدم زۆر کۆنە.

٣- پێشمەرگەکان سنووری وڵاتیان گەلێك باش پاراستووە.

## ڕاهێنانی(٤)

لە ڕستەی (داڕشتنێکی باشم بەجوانی نووسییەوە)

١- کاری ڕستەکە لە چ ڕێژەیەکدایە؟

٢- وشەی(بەجوانی) چییە؟ چۆن دروستکراوە؟

٣- وشەی (باش) چییە؟ ئەرکی چییە؟

٤- وشەی(زۆر) بخەرە پێش (باش) و (بەجوانی) لە هــەردوو شــوێندا وشــەی (زۆر) شیبکەوە.

# دیارخەرەکانی ناو

## یەکەم- ئەرکی ناو لەرستەدا وەکو دیارخەری ناو

١- ئاوی کانی لە ئاوی ڕووبار پاکترە.

٢- دێهاتەکانی کوردستان ئاوەدانکرانەوە.

٣- کرێکارەکانی کارگەی مافوور دڵسۆزانە کاردەکەن.

٤- تابلۆکانی ژوورەکەم هەڵواسیوەتەوە.

٥- هێمن نەمامەکانی لە باخچەی خوێندنگەکەدا ڕواند.

٦- دیارییەکانم بۆ فەرمانبەرانی فەرمانگاکەیە.

٧- مەم وزین داستانێکی فولکلۆری بوو.

٨- خانووەکانی ئەم شارە جوانن.

هەریەکە لە بەشە ئاخاوتنی (ناو – هاوەڵناو– جێناو) دەتوانێت ببێت بە دیارخەری ناو یان ئەو وشانەی لە هێزی ناودان (چاوگ)، لێرەدا باسی ناو وەکو (دیارخەر) دەکەین:

١- لە ڕستەی یەکەمدا، وشەی (ئاو) ناوێکی تاکی نەناسراوی گشتییەو (دیارخراو)ە، وشەی (کانی) و (ڕووبار)یش، دوو ناوی تاکی نەناسراوی گشتیین (دیارخەر)ن، کە بە یارمەتی (ی) ئامرازی خستنەسەر[1] دراونەتە پاڵ یەك، (ئاوی کانی) وەکو گرێیەکی ناوی ئەرکی نیهاد و (ئاوی ڕووبار) ئەرکی تەواوکەری بەیاریدە دەبینێت.

---

[1] ئامرازی خستنەسەر: ئامرازی دانەپاڵ.

٢- لـه ڕسـتـەی دووەمـدا، وشـەی (دێهاتـەکان) نـاوێکی کـۆی ناسـراوەو (دیـارخراو)ە، وشـەی (کوردسـتان) نـاوێکی تایبەتییـە (دیارخـەر)ی وشـەی (دێهاتەکان)ە، کە بەهۆی (ی) ئامرازی خستنەسەر پێکهاتووە، (دێهاتـەکانی کوردستان) وەکو گرێیەکی ناوی دەبێتە جێگری بکەر.

٣- لـە ڕسـتـەی سـێیەمدا، وشـەی (کرێکارەکـان) نـاوێکی کـۆی ناسـراوە (دیارخراو)ە، هەر دوو وشەی (کارگـەی مـافوور) دوو نـاوی تـاکی نەناسـراون (دیارخەر)ی وشـەی (کرێکارەکـان)ە، کـە بـەهۆی (ی) ئـامرازی خستنەسـەر پێکهاتووە.

٤- لـە ڕسـتـەی چـوارەمدا، وشـەی (تابلۆکـان) نـاوێکی کـۆی ناسـراوە (دیارخراو)ە، وشەی (ژوورەکە) ناوێکی تاکی ناسراوە (دیارخـەر)ە و بـەهۆی (ی) ئـامرازی خستنەسـەر دراوەتـە پـاڵ (دیـارخراو) لێرەشـدا (تابلۆکـانی ژوورەکە) وەکو گرێیەکی ناوی ئەرکی بەرکار دەبینێت.

٥- لـە ڕسـتـەی پێنجەمـدا، وشـەی (باخچـە) نـاوێکی تـاکی نەناسـراوە (دیارخراوە)، وشەی (خوێندنگەکە) ناوێکی تاکی ناسراوە (دیارخەر)ی نـاوی باخچەکەیە، بەهۆی (ی) ئامرازی خستنەسەر دراونەتـە پـاڵ یـەك، (باخچـەی خوێندنگەکە) وەکو گرێیەکی ناوی دەبێـت بـە تەواوکـەری بەیاریدەی کـاری تەواو.

٦- لە ڕستەی شەشـەمدا، وشـەی (فەرمانبـەران) نـاوێکی نەناسـراوی کۆیـە (دیـارخراو)ە، وشـەی (فەرمانگاکـە) نـاوێکی تـاکی ناسـراوە (دیـار خـەر)ە، بـەهۆی (ی) ئـامرازی خستنەسـەر دراوەتـە پـاڵ (دیـارخراو)، (فەرمانبـەرانی فەرمانگاکـە) وەکـو گرێیـەکی نـاوی دەبـن بـە تەواوکـەری بەیاریـدەی کـاری ناتەواو.

٧- لەڕستەی حەوتەمدا، وشەی (داستانێك) ناوێکی تاکی نەناسراوە (دیارخراو)ە، وشەی (فۆلکلۆر) ناوێکی نەناسراوی گشتییە (دیارخەر)ە، بەهۆی (ی) ئامرازی خستنەسەر دراونەتە پاڵ یەك (داستانێکی فۆلکلۆر) وەکو گرێیەکی ناوی ئەرکی تەواوکەری کاری ناتەواوە.

٨- لە ڕستەی هەشتەمدا، وشەی (خانووەکان) ناوێکی کۆی ناسراوە (دیارخراو)ە، وشەی (شار) ناوێکی گشتییەو بەهۆی هاوەڵناوی نیشانە (ئەم.....ە) دەستنیشان کراوە (دیارخەر)ە، (ی) ئامرازی خستنەسەر دەکەوێتە نێوانیانەوە، (خانووەکانی ئەم شارە) گرێیەکی ناوییە لە (دیارخراو و دیارخەر)ەکاندا، پێویستە ئاگاداری ئەوەبین، کە هەریەکە لە (دیارخراو) و (دیارخەر) کە دەدرێنە پاڵ یەکتری دەبێت لەگەڵ ڕاستیدا بگونجێن، بە تایبەتی ئەگەر ناوە (دیارخراو)ەکە ناوێکی کۆ بێت و (دیارخەر) ناوێکی تاك بێت، چونکە ناگونجێت بڵێین (دڵەکانی پیاوەکە ، مێشکەکانی ژناکە ، نینۆکەکانی پەنجەکە......) ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە دەتوانین بەپێی شوێن و مەبەست بەمەرجێك لەگەڵ ڕاستیدا بگونجێت، (دیارخراو) و (دیارخەر)، یان هەردووکیان لەشێوەی (تاك ، کۆ ، ناسراو یان نەناسراویدا) لە ناوڕستەدا بەکاربهێنین ، وەکو لە ڕستەکانی سەرەوەدا نیشانمان داون.

هەروەها دەبێت ئاماژە بەوە بکەین کە ناوی (دیارخراو) دەتوانێت چەند ناوێکی (دیارخەر)ی یەك لە دوای یەك وەربگرێت، وەك:

**یاساکانی پەرلەمانی هەرێمی کوردستان زۆرن.**

**بەکورتی :**

**ئەگەر ناوێکی ( دیارخراو ) ( دیارخەرێك ) یان چەند دیارخەرێك بدرێتە پاڵی ئەوا :**

**١- ناوی ( دیارخراو ) پێش ناوی ( دیارخەر ) دەکەوێت.**

**٢- ( ی ) ئامرازی خستنەسەر دەکەوێتە نێوانیانەوە(١).**

**٣- دەتوانین ناوە دیارخراوەکە یان دیارخەرەکەی، یان هەردووکیان بە پێی شوێن و مەبەست، بەمەرجێك لەگەڵ ڕاستیدا بگونجێت لە شێوەی ( تاك ، کۆ، ناسراو ، نەناسراو )دا لەناو ڕستەدا بەکاریان بهێنین.**

| دەرگا | ی | ژوورەکە | کراوەتەوە |
|---|---|---|---|
|  |  |  |  |
| دیارخراوە | ئامرازی خستەسەر | دیارخەرە | کار |

**هەروەها ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە لە پەیوەندی نێوان دیارخراو و دیارخەردا خاوەنێتی و ناسیاوی و تایبە تمەندێتی دروست دەبێت.**

---

(١) لە کرمانجی ژووروودا ئامرازی خستنە سەر بەپێی ژمارەو ڕەگەز خۆیان دەنوێنن ئامرازی(ا)بەدیارخراوی (مێ) ی تاك دەلکێنن وەك :

**زین خوشکا میرێ بۆتانێ بوو.**

**ئەو ژنەکا میهرەبان بوو.**

وە (ێ) بەدیارخراوی (نێر)ی تاك دەلکێنین، وەك:

**کوڕێ پاشایێ بچویك هات.**

**مەلایێ جزیری هۆزانڤانەکێ کورد بوو.**

هەروەها (ێد — ێت — ێن) بەدیارخراوی کۆی (نێرومێ)ەوە دەلکێن، وەك:

**شارێد کوردستانێ خۆشن.**

**زارۆکێن گوندێن مە زرنگن.**

## ڕاهێنان(١)

لە ڕستەی (پەرتووکەکانی قوتابییان وەردەگرینەوە)دا:

١- وشەی (قوتابییان) چییە؟ ئەرکی چییە؟

٢- کاری (وەردەگرینەوە) لە چ ڕێژەیەکدایە؟

٣- وشەی (پەرتووکەکان) شیبکەرەوە.

٤- لە کاری (وەردەگرینەوە) ڕێژەی ڕابردووی تەواوی دانانی دروستبکەو سەر لە نوێ ڕستەکە بنووسەرەوە.

٥- لە کاری (وەردەگرینەوە) ڕێژەی ڕابردووی بەردەوامی ڕاگەیاندن دروستبکەو بیدە پاڵ جێناوە کەسییە لکاوەکان بەپێی: ژمارەی کەس.

## ڕاهێنان(٢)

ڕستەی گونجاو بو ئەم داواکارییانەی خوارەوە بهێنەرەوە:

١- ناوێکی کۆی ناسراو ببێتە دیارخەری ناوێکی نەناسراو هەردوو (دیارخراو و دیارخەر) ببنە بەرکار.

٢- دوو ناوی یەك لە دوای یەك ببنە دیارخەری ناوێکی دیارخراوی تاکی ناسراو.

٣- ناوێکی دەستنیشانکراو بەهۆی هاوەڵناوی نیشانە بۆ نزیك ببێتە دیارخەری ناوێکی تاکی نەناسراو.

## ڕاهێنان (٣)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا دیارخراو و دیارخەر دەربهێنە.

١- هونەرمەندانی کوردستان دەست ڕەنگینن.

٢- ئۆتومبێلەکانی پیشانگەکە دەفرۆشرێن.

٣- مامۆستایانی کوردستان دڵسۆزن.

٤- خوێندنی باڵا لە زانکۆکان کرایەوە.

## ڕاهێنان (٤)

شیکردنەوە: نموونە

هۆنراوەکانی مەولەویم خوێندەوە.

هۆنراوەکان: ناوە، ناسراوە، کۆیە، دیارخراوە، بەرکارە.

ی: ئامرازی خستنەسەرە.

مەولەوی: ناوە، تایبەتییە، دیارخەرە.

هۆنراوەکانی مەولەوی: گرێیەکی ناوییە، بەرکارە.

م: جێناوی لکاوە بۆ کەسی یەکەمی تاک، بکەرە .

خوێندەوە: کاری ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندنە، داڕێژراوە، تێپەڕە.

١- تیپی کچان شانۆگەرییەکەیان نمایشکرد.

٢- کلتوری کورد دەپارێزین.

## دووەم- ئەرکی هاوەڵناولەرستەدا وەکو دیارخەری ناو

١- زێڕی پاك ژەنگ هەڵناهێنێت.

خوێندکارێکی زیرەکم بۆ پێشبڕکێکە نارد.

٢- ئەندازیارە بە تواناکە نەخشەی تەلارەکەی کێشا.

درەختە بەرزەکان سیمایەکی جوان بە ژینگە دەبەخشن.

٣- ئ- ئەستێرە گەشەکە دەرکەوت.

گەزۆ نایابەکان فرۆشران.

بەهێ گەییوەکانم لێ کردەوە.

خوێندنگا سەرکەوتووەکان ئاهەنگیان گێڕا.

ب- دۆیە ترشەکەی ڕۆکرد.

بایە بەهێزەکە هەڵی کرد.

دێیە خۆشەکانیان بینیوە.

شەیە[1] بچووکەکە بکڕە.

٤- لە کانییە ڕوونەکان پرۆژەی ئاوی گوندەکان دروست دەکەن.

شاتووە سورەکەم خوارد.

بییە سەوزەکان مەبڕنەوە.

٥- ئەم زانکۆیە پێشکەوتووە.

چوار گۆڤارم کڕی.

کام یاریزان ئامادە نەبوو.؟

ڕۆژگار هەموو مرۆڤێك دەردەخات.

جوانترین دیاریی پێشکەش کردم.

---

[1] شە : شانە

٦- گوڵی چۆنت دەوێت؟

ڕۆمانی چوارەمینم نووسی.

فەرهەنگێکی تر بەکار دەهێنم.

نامەیەکی ڕازەوەتری نارد.

٧- چواریەکی وێنەکەم ڕەنگ کرد.

هاوەڵناو، وشەیەکە پەسنی ناوێك یان جێناوێك دەکات، هەموو جۆرەکانی هاوەڵناودەتوانن ببنە دیارخەری ناوێك یان جێناوێك، لەم ڕووەوە لە هاو ڕەگەزەکانی جیادەکاتەوە. هاوەڵناوی چۆنیەتی (سادە ، داڕێژراو ، لێکدراو) بێت دەبێتە دیارخەرو بەپێی چەند مەرجێك دەدرێتە پاڵ ناو:-

١/ ئەگەر ناوە دیارخراوەکە، ناوێکی گشتی نەناسراو، یان ناوێکی تاکی نەناسراو بێت، هاوەڵناوێك ببێت بە دیارخەری، ئەوا پێویستە (ی) ئامرازی خستنەسەر بخەیتە نێوان ناوەکەو هاوەڵناوەکەوە، وەك لە نموونەکانی ڕیزی (١) نیشاندراون. لە ڕستەی یەکەمدا، وشەی (زێڕ) ناوێکی گشتییە و نەناسراوە هاوەڵناوی (پاك) لە دوایەوە هاتووەو بووە بەدیارخەری.

لەبەشی دووەمی ڕستەی یەکەمدا، (خوێدنکارێك) ناوێکی تاکی نەناسراوەو هاوەڵناوی (زیرەك) لە دوایەوە هاتووە، لەبەر ئەوە پێویستە (ی) ئامرازی خستنە سەر بکەوێتە نێوانیانەوە.

٢/ ئەگەر ناوە دیارخراوەکە، ناوێکی (تاك یان کۆی ناسراو) بوو، کاتێك هاوەڵناوێك دەبێتە دیارخەری، ئەوا پێویستە ناوەکەو هاوەڵناوەکە بخەینە سەر شێوەی (ناوێکی لێکدراو)ەوە، ئینجا نیشانەی پێناسینەکەی دەخرێتە دوای هاوەڵناوەکەوە، خۆ ئەگەر چەند هاوەڵناوێکی یەك لە دوای یەك بوون

بـە دیارخـەری ناوەکـە، ئـەوا نیشـانەی ناسـراوی دەکەوێتـە دوای هـەموو هاوەڵناوەکانەوە.

جا ئەگەر ناوەکە بەپێتیکی (نەبزوێن) کۆتایی هاتبێت، ئەوا لـە جیاتی (ی)، ئامرازی دانە پاڵی (ە) دەخەینـە نێوان ناوەکـەو هاوەڵناوەکـەوە، وەکو لـە ڕستەی (ئەندازیارە بەتواناکە......)ی ریزی ژمارە (٢)دا نیشاندراوە.

لەم ڕستـەیەدا (ئەنـدازیار) ناوێکـە بـە پیتـی نـەبزوێنی (ر) کۆتـایی هـاتووە، کاتێك کە دەکرێت بەناسراو و هاوەڵناوێك دەبێتە دیارخـەری، ئـەوا پێویسـتە بەو شێوەیەی سەرەوە بخرێتە شێوەی (ناوێکی لێکدراوە)وە، (ی) ئـامرازی دانەپاڵ بکرێت بە (ە).

بەڵام ئەگەر ناوە دیارخراوەکە، لە شێوەی کۆی ناسراودا بێـت و هاوەڵناوێـك ببێـت بـە دیارخـەری ئـەوا بـە پێـی دەسـتوورەکەی پێشـوو، لەگـەڵ هاوەڵناوەکەدا دەخرێتە شێوەی (ناوێکی لێکدراو)ەوە، لـە دوایـدا نیشـانەی ناسـراوییەکەی کـە (ەکـە)و نیشـانەی کـۆ، کـە (ان)ە دەخرێنـە دوای هەموویانەوە، وەکو لە ڕستەی (درەختە بەرزەکان.....) نیشاندراوە.

٣- ئەگەر ناوە دیارخراوەکە (تاك یان کۆی ناسراو) بێت و بـە پیتـی بزوێنـی (ە ، ا ، ۆ ، ێ) دوایی هاتبێت و لە برگەیـەك زیـاتر بێـت، کاتێـك هاوەڵناوێـك دەبێت بە دیارخەری واتە (تەواوکـەری)، دیسـان وەکـو دەسـتووری پێشـوو، دەخرێتە شێوەی (ناوێکی لێکدراو)ەوە، جا بۆ ئەوەی (ە)ی ئامرازی دانەپاڵ لەگەڵ پیتی بزوێنی دوای وشە یەکنەگرن و بـە پێـی دەسـتووری (برگـە) کـە نابێـت دوو بـزوێن لەیـەك برگـەدابن، ئـەوا ئامرازەکـە لادەبـەین، وەکـو لـە ڕستەکانی ڕیزی (٣) بەشی (ئـ) نیشاندراون.

بەڵام ئەگەر ناوە دیارخراوەکە (تاك یان کۆی ناسراو) بێت و کۆتایی بە پیتی بزوێنی (ا ، ۆ ، ێ ، ە) هاتیبێت و لە بڕگەیەك پێکهاتبێت و هاوەڵناوێك ببێت بە دیارخەری، دوای ئەوەی کە ناوەکەو هاوەڵناوەکە دەخرێتە سەر شێوەی (ناوێکی لێکدراو)، (ە)ی ئامرازی دانەپاڵ بە یارمەتی ناوبەندی (یـ) کە دەکەوێتە نێوان ناوەکەو ئامرازی خستنە پاڵەکە پاشان نیشانەی ناسراوی و کۆ دەخرێتە دوای هاوەڵناوەکەوە، وەکو لە ڕستەکانی ریزی ژمارە (٣) بەشی (ب) نیشاندراون.

٤- بەڵام ئەگەر ناوەکە بە بزوێنی (ی) یان (وو) دوایی هاتبێت لە شێوەی (تاك یان کۆی ناسراو) دابێت، هاوەڵناوێك ببێتە دیارخەری، ئەوا ناوەکەو هاوەڵناوەکە دەخرێنە سەر شێوەی (ناوێکی لێکدراو)ەوە، جا بۆ ئەوەی بزوێنی وشەو ئامرازەکە یەکنەگرن، پێویستە پیتی نەبزوێن، کە بگونجێت لەگەڵیاندا، بخەینە نێوانیانەوە بۆ یەکەمیان (ی = y)، بۆ دووەمیان (و = W) دادەنێن لە ناوەکەش (وو) درێژ دەگۆڕێت بۆ (و) کورت وەکو لە ڕستەکانی ڕیزی ژمارە (٤) نیشاندراون.

٥- هەروەها هاوەڵناوی ژمارە، هاوەڵناوی نیشانە (ئەم.....ە) (ئەو.....ە)، هاوەڵناوی پرس (کام ، چ...)، هاوەڵناوی نادیار (هەموو ، زۆر.....)، هاوەڵناولە پلەی باڵادا ( گەورەترین ، جوانترین ....) دەتوانن ببن بە دیارخەری ناو، جا ئەگەر پێش ناوە دیارخەرەکە بکەون، ئەوا پێویستی بە ئامرازی خستنە سەر ناکات، وەکو لە ڕستەکانی ژمارە (٥) نیشاندراون.

٦- ئەگەر هاوەڵناوە دیارخەرەکان دوای ناوە دیارخراوەکە بکەون، ئەوا پێویستی بە (ی) ئامرازی خستنە سەر هەیە، وەکو لە ڕستەکانی ڕیزی ژمارە (٦) دا نیشاندراون، ئەو هاوەڵناوانەی کە دەکەونە دوای ناوە دیارخراوەکەوە

هاوەڵناوی (ژمارەی ڕێکخستن ـ پرس ـ نادیار ـ هاوەڵناوی پلەی بەراورد)ن لە ڕستەی یەکەمدا، (چۆن) هاوەڵناوی پرسەو دیارخەری وشەی (گوڵ)ە، لە دووەمدا، (چوارەمین) هاوەڵناوی ژمارەی ڕێکخستنە و دیارخەری ناوی (ڕۆمان)ە، لە سێیەمیاندا، هاوەڵناوی نادیار(تر) دیارخەری ناوی (فەرهەنگ)ە، لە چوارەمیاندا (ڕازاوەتر) هاوەڵناوی پلەی بەراوردەو دیارخەری ناوی (نامە)یە.

٧- بەدەر لەوانەی، کە باسمان کردن هاوەڵناوی ژمارەی کەرتی، وەکو دیارخەرێك دەکەوێتە پێش ناوە دیارخراوەکەوە پێویستی بە (ی) ئامرازی خستنە سەر دەبێت، وەك لە ڕستەی ژمارە (٧) نیشاندراوە.

هەروەها ناوە دیارخراوو هاوەڵناوەکان لە چوار چێوەی وشەیەکی لێکدراو، یان گرێیەکی ناویدا دەتوانن ئەرکی ناوبببینن لە ڕستەدا.

## بەکورتی:-

**هاوەڵناوی چۆنیەتی (سادە ، دارێژراو ، لێکدراو) دەتوانن ببن بە دیارخەری ناوێك و لەچەند شێوەیەکی جیاوازدا دەردەکەوێت:**

**١- ئەگەر ناوە دیارخراوەکە[1]، ناوێکی تاکی نەناسراو، یان ناوێکی گشتی بێت، هاوەڵناوێکی بەدوادا هاتبێت، ئەوا دیارخراو پێش هاوەڵناوی دیارخەر دەکەوێت و (ی) ئامرازی خستنە سەر دەکەوێتە نێوانیانەوە.**

**٢- ئەگەر ناوە دیارخراوەکە تاك یان کۆی ناسراو بێت، دیارخراو پێش دیارخەر دەکەوێت و هەردووکیان دەخرێنە شێوەی ناوێکی لێکدراوەوە، ئینجا نیشانەی ناسراوی کۆ دەخرێتە دوای هاوەڵناوەکەوە، لێرەدا پێویستە**

---

[1] دەشێت دیارخراو جێناوی کەسی سەربەخۆ بێت.

ئاگاداری ناوە دیارخراوەکە بین بە تایبەتی ئەگەر بە پیتی ( بزوێن ) دوایی هاتبێت، چونکە پێویستی بە چەند دەستوورێکی تایبەتی هەیە بۆ لێکدانی ناوەکەو هاوەڵناوەکە.

٣- ئەگەر هاوەڵناوە دیارخەرەکان لە جۆری ئەوە هاوەڵناوانە بن، کە دەکەونە پێش ناوە دیارخراوەکەوە، وەکو هاوەڵناوی ( ژمارە ــ نیشانە ــ نادیار ــ پرس ــ هاوەڵناوی پلەی باڵا ) ئەوا پێویستیان بە ( ی ) ئامرازی خستنە سەر نییە، بێجگە لە هاوەڵناوی ژمارەی کەرتی کە پێویستی بەم ( ی ) یە هەیە، خۆ ئەگەر دوای ناوەکە بکەون وەك هاوەڵناوی ( ڕێکخستن ، پرس ، نادیار ، هاوەڵناوی پلەی بەراورد ) ئەوا پێویستیان بە ( ی ) ئامرازی خستنە سەر دەبێت.

## ڕاهێنان (١)

هاوەڵنـاوی (خـۆش ، هەڵکـەنراو ، خەباتکـەر) لـە سـێ ڕسـتەدا بەکاربهێنـە بـە مەرجێك، یەکەمیان ببێتە دیارخەری ناوێکی تاکی نەناسراو، دووەمیان دیارخـەری ناوێکی تاکی ناسراو بێت، سێیەمیان دیارخەری ناوێکی کۆی ناسراوبێت.

## ڕاهێنان (٢)

١– ئایا دەشێت چەند هاوەڵناوێکی یەك لە دوای یـەك بـبن بـە دیارخـەری ناوێـك؟ چۆن؟ وەڵامەکەت بە نموونەوە بسەلمێنە.

٢– ئەو هاوەڵناوانە کامانەن کە دەبن بە دیارخەری ناوو پێویستییان بـە ئـامرازی خستنە سەری (ی) نییە، وەڵامەکەت بەنموونەوە بسەلمێنە.

## ڕاهێنان (٣)

دیارخەرەکانی ئەم ڕستانە خوارەوە. دەربهێنە و جۆرەکەشی دەست نیشان بکە.

١– بەکام قوتابیدا نامەکەت بۆ ناردم؟

٢– زۆر کورد بەناهەق شەهیدکران.

٣– ئێوەی زیرەك هەمیشە سەرکەوتوون.

## ڕاهێنان (٤)

لە ڕستەی (پێشمەرگە بوێرەکە خەڵاتکرا).

١– لـەنێوان وشـەکانی (پێشـمەرگە) و(بوێرەکـە) چ ئامرازێـك بەکارنـەهاتووە؟ بۆچی؟

٢– نـاوێکی تـر بهێنـەوە بەهـەمان بزوێنـی (ە) کۆتـایی هاتبێـت بـەڵام ئامرازەکـە بەکارهاتبێت، هۆیەکەشی بنووسە.

٣– وشەی(بوێر) چی یە؟ چۆن دروست کراوە.

٤– ناوی(پێشمەرگە) ناوێکی تاکی ناسراوە، کـوا نیشـانەی ناسـراویەکەی؟ بۆچـی کەوتۆتە ئەوێ؟

## سێیەم- ئەركی جێناوی كەسی سەربەخۆ لە ڕستەدا وەكو دیارخەری ناو

١- خەڵاتەكەی من بەنرخە. (من ـ تۆ ـ ئەو[1]
ئێمە ـ ئێوە ـ ئەوان)

٢- خانووەكەی خۆتم پێبفرۆشە. (خۆم ـ خۆت ـ خۆی
خۆمان ـ خۆتان ـ خۆیان)

٣- چیرۆكی كێ خوێنرایەوە؟ (كێ ـ چی ......)

٤- دیسكەكەم بۆ كۆمپیوتەرەكەی هین بوو. ( هین ـ فلان ـ كابرا
فیسار ـ كەس..)

٥- تاقیكردنەوەكەم لە تاقیگەی ئەمانەدا ئەنجام دا. (ئەوە ـ ئەوانە
ئەمە ـ ئەمانە).

٦- ئەوانە دەفتەرەكانی ئێمەنە.

٧- گەنجانی شارەكەی من بەئاوات دەگەن.

**هەروەكو دەزانین جێناوەكان دەكرێن بە دوو بەشەوە:**

١- جێناوی سەربەخۆ (جودا).

٢- جێناوی كەسی لكاو.

**ئەو جێناوە سەربەخۆیانەی كە دەبن بە دیارخەری ناو بریتین لە:**

١- جێناوی كەسی سەربەخۆ[2].

٢- جێناوی خۆیی.

٣- جێناوی پرس.

---

(١) كۆمەڵە جێناوی من ، تە ، وی ، وێ بەكاردێت وەكو
وەڵاتێ مە خۆشە.

(٢) جێناوی هەیی نابێت بە دیارخەری ناو.

٤- جێناوی نادیار.

٥- جێناوی نیشانە.

ئەگەر جێناوە سەربەخۆکان ببن بە دیار خەری ناوێك ئەوا ناوی دیارخراو هەمیشە پێشدەکەوێت، هەر لەبەر ئەمە پێویستە (ی) ئامرازی خستنەسەر بخرێتە نێوانیانەوە، دەتوانین ناوە دیارخراوەکەش بەپێی شوێن و مەبەست بەمەرجێك لەگەڵ ڕاستیدا بگونجێت لە شێوەی تاك و کۆ و ناسراو یان نەناسراویدا بەکاربهێنن وەکو لە ڕستەکانی بەشی سەرەوەدا ئاشکرا کراون.

لەو ڕستانەدا هەریەکە لە جێناوی (من – خۆت – کێ – هێن – ئەمانە – ئێمە – ئێوە) لە شوێنی خۆیدا دیارخەری ناوەکەی پێش خۆیەتی (دیارخراو و دیارخەر) لە چوارچێوەی گرێیەکی ناویدا، ئەرکی تایبەتی هەیە.

لە ڕستەی یەکەمدا (خەڵاتەکەی من) نیهادە، لە دووەمدا (خانووی خۆت) بەرکارە، لە سێیەمیاندا (چیرۆکی کێ) جێگری بکەرە، لە چوارەمیاندا (کۆمپیوتەرەکەی هێن) تەواوکەری بەیاریدەی کاری ناتەواوە، لە پێنجەمیاندا (تاقیگەکەی ئەمانە) تەواوکەری بەیاریدەی کاری تەواوە، لە شەشەمیاندا (دەفتەرەکانی ئێمە) تەواوکەری کاری ناتەواوە، لە حەوتەمیاندا (گەنجانی شارەکەی من) بکەرە.

**بە کورتی:-**

**ئەگەر جێناوی سەربەخۆ[1] ببێتە دیارخەری ناوێك ئەوا هەمیشە:**

**١- ناوە دیارخراوەکە پێش جێناوی سەربەخۆی دیارخەر دەکەوێت.**

**٢- (ی) ئامرازی خستنەسەر دەکەوێتە نێوانیانەوە.**

---

[1] جگە لە جێناوی سەربەخۆ، کۆمەڵەی جێناوە کەسییە لکاوەکانیش دەبنە دیارخەری ناو، ئەم جۆرەیان لە باسی ئەرکی جێناوی کەسیی لکاوە لە دەوری دیارخەری ناودا نیشان دراوە.

## ڕاهێنان (١)

ئەو جێناوە سەربەخۆیانە کامانەن کە دەبن بە دیارخەری ناو؟ بیانژمێرەو نموونە بۆ هەریەکەیان بهێنەرەوە لە ڕستەدا.

## ڕاهێنان (٢)

ئەرکی ئەم گرێیانەی خوارەوە کە هێڵیان بەژێردا هاتووە دەستنیشان بکە.

١- گیانی من بۆ تەڵێ وەنەوشە پەرۆشە

کە لە ژێر سێبەری تووترکا خامۆشە

٢- دەستم لە گەردنی خۆت هەڵمەگرە ئەی حەبیبە

وابزانە خوێنی خۆمە یا مننەتی ڕەقیبە.

٣- جوان هۆنراوەکانی ئەمانەی کۆکردەوە.

٤- کچە زیرەکەکە خەڵاتکراوە.

## ڕاهێنان (٣)

لە ڕستەی (شاخەکانی کوردستان سەرکەشن)

١- (ی) دوای (شاخەکان) چییە؟ بۆ خراوەتە ئەویێ؟

٢- لەجیاتی وشەی (کوردستان) جێناوێك بەکاربهێنە و سەرلەنوێ ڕستەکەش بنووسەوە.

٣- کاری ڕستەکە دەستنیشان بکە.

٤- تەواوکەری کارەکە شیبکەوە.

## ڕاهێنان (٤)

لە ڕستەی ( مۆبایل پەیوەندییەکانی ئێمەی ئاسانتر کردووەتەوە.)

١- وشەی (پەیوەندییەکان) چ جۆرە جێناوێك دیارخەریەتی؟ چەند جۆرە جێناوی سەربەخۆی تریش دەبنە دیارخەری؟

٢- (ئێمە) بگۆڕە بۆ جێناوی لکاو، چ گۆڕانێك ڕوودەدات بینوسەوە.

٣- گرێ ی (پەیوەندیەکانی ئێمە) ئەرکی چییە لە ڕستەکەدا؟

## ٤- ئەركی جێناوی كەسی لكاو لەرستەدا وەكو دیارخەری ناو

ئـ-

١- هاوڕێكەم چوو بۆ سەیرانگای دووكان. (م ـ مان ، ت ـ تان ، ی ـ یان).

٢- مامۆستاكەمان دێت بۆ سەیركردنی پێشانگەكە.

٣- كتێبخانەی شارەكەمان نۆژەن دەكەنەوە.

٤- بەیانی گۆرانییە نوێیەكەم تۆماردەكەم.

٥- زیندانییەكانمان ئازاد كران.

٦- پەیامەكەمان بگەیەنن بە هاوولاتییان.

ب-

١- نامەكەتم گەیاند.

٢- نامەكەم گەیاندیت.

٣- پێنووسە سەوزەكەتم برد.

٤- پێنووسە سەوزەكەم بردیت.

جێناوی كەسیی لكاو دەتوانێت ببێت بەدیارخەری ناو، بەلام پێویستە لە پێش هەموو شتێكدا ئەوە بهێنینەوە یادمان، كە ئەم بەدیارخستنە پێویستی بە (ی) ئامرازی خستنە سەر نابێت، وەك لەم شێوانەی خوارەوە بەدی دەكرێت:

ئـ- ئەگەر كاری ڕستەكە ڕانەبردووی (تێپەڕ یان تێنەپەڕ)، ڕابردووی تێنەپەڕ، یان بكەر نادیار یان داخوازی بێت، ئەوا هەمیشە جێناوی لكاوی دیارخەری ناو یەكسەر دوای ناوە دیارخراوەكە دەكەوێت، خۆ ئەگەر ناوە دیارخراوەكە بەناوێك یان چەند ناوێك یان بە هاوەڵناوێك بەدیارخرا، ئینجا بە

جێناوی لکاو بەدیاریبخرێت، ئەوا جێناوە لکاوە دیارخەرەکە لە دوای هەموو دیارخراوەکان دێت، وەك لە ڕستەکانی بەشی وە (ئـ) نیشاندراوە.

لەڕستەی یەکەمدا، کاری ڕستەکە تێنەپەڕەو لەدەمی ڕابردوودایەو جێناوی کەسیی لکاوی (م) بووە بەدیارخەری وشەی (هاوڕێ).

لەڕستەی دووەمدا، جێناوی کەسیی لکاوی (مان) بووە بەدیارخەری ناوی (مامۆستاکە) و کاری ڕستەکە ڕانەبردووی تێنەپەڕە.

لەڕستەی سێیەمدا، ناوی (کتێبخانە) بەناوی(شارەکە) دیارخراوە، ئینجا جێناوی کەسی لکاوی (مان) بووە بەدیارخەری و کاری ڕستەکە ڕانەبردووی تێپەڕە، گرێی (کتێبخانەی شارەکە) بەرکارە.

لەڕستەی چوارەمدا، هاوەڵناوی (نوێ) دیارخەری ناوی (گۆرانییە)، ئینجا جێناوی لکاوی (م) بووە بەدیارخەری، کارەکەش ڕانەبردووی تێپەڕە.

کەوابوو، ئەگەر کاری ڕستەکە (ڕانەبردووی تێپەڕیان تێنەپەڕبێت)، (ڕابردووی تێنەپەڕ)، بکەر (نادیار) یان (داخوازی) بێت ئەوا کۆمەڵە جێناوی کەسیی لکاوی (م ـ مان ، ت ـ تان ، ی ـ یان) بەپێی مەبەست بۆ کەسی یەکەم و دووەم و سێیەمی تاك و کۆ بەپێی مەبەست لە دەوری دیارخەری ناودا بەکاردەهێنین، بەڵام ئەگەر ناوەکە بە ناوێك یان چەند ناوێك دیارخرا، ئەوا جێناوی لکاوی دیارخەر لە دوای هەموو دیارخراوەکانەوە دێت،

خۆ ئەگەر هاوەڵناوێك بوو بەدیارخەری ناوەکەو پاشان جێناوی کەسیی لکاو بوو بە دیارخەری، ئەوا ناوەکەو هاوەڵناوەکە دەخرێتە شێوەی ناوێکی لێکدراوە و پاشان جێناوە کەسییە لکاوەکە دەبێت بە دیارخەری.

ب– ئەگەر کاری ڕستەکە، کارێکی ڕابردووی تێپەڕبێت و بمانەوێت ئەو ناوەی کە ئەرکی بەرکار دەبینێت، جێناوێکی کەسیی لکاو ببێت بەدیارخەری ئەوا دەشێت بە دوو شێوە بێت:

ئـ– جێناوە لکاوە دیارخەرەکە یەکسەر لە دوای ناوە دیارخراوەکەوە بێت، وەکو (نامەکەتم گەیاند)، لێرەدا جێناوی کەسیی لکاوی (ت) دیارخەری ناوی (نامەکە)یەو، جێناوی کەسیی لکاوی (م) بکەری ڕستەکەیە، جا بە پێی مەبەست دەتوانین لە شوێنی جێناوی (ت) جێناوە کەسییە لکاوەکانی (م ــ مان ، ت ــ تان ، ی ــ یان) بەکاربهێنین، خۆ ئەگەر ناوە دیارخراوەکە هاوەڵناوێك بووبێت بەدیارخەری پاشان بە جێناوێکی کەسیی لکاو دیارخرا، ئەوا جێناوە کەسییەکە دەچێتە دوای هاوەڵناوەکەوە، وەك لە ڕستەکانی بەشی (ب) نیشاندراوە.

ب– یان جێناوە کەسییە لکاوە دیارخەرەکە دەچێتە دوای کارەکەوە، وەکو لە ڕستەی (نامەکەم گەیاندیت) نیشاندراوە، لێرەدا دیسان (م) بکەری ڕستەکەیەو جێناوی لکاوی (یت) دیارخەری (نامەکە)یە و لە دوای کاری ڕستەکەوە هاتووە، دەتوانین لە شوێنی ئەم جێناوە کۆمەڵەی (م ، ین ، یت ، ن ، (Ø) ،ن) بەڕیز بۆ کەسی یەکەم و دووەم و سێیەمی تاك و کۆ بەکارهێنین.

### سەرنج:

١- ئەگەر جێناوێکی لکاو بوو بە دیارخەری ناوێک، ئەوا هیچ وشەیەکی تر نابێت بەدیارخەری ناوەکە، چونکە دەبێتە هۆی تێکچوونی دارشتنی ڕستەکەو شێواندنی واتاکەی بۆ نموونە ناتوانین بڵێین:

پەنجەرەکەمان خانووەکە گەورەیە.

٢- ناوە دیارخراوەکە و جێناوە کەسییە دیارخەرەکە وەکو گرێیەکی ناوی دەتوانن ئەرکەکانی ناو ببینین لە ڕستەدا.

### بەکورتی:

**١- کۆمەڵە جێناوە لکاوەکانی ( م ـ مان ، ت ـ تان ، ی ـ یان ) دەبنە دیارخەری ناوو دەچنە دوای ناوە دیارخراوەکە، جا ئەگەر ناوە دیارخراوەکە بەناوێك یان بە هاوەڵناوێك دیار خرابێت ئەوا جێناوە لکاوە دیارخەرەکە دەکەوێتە دوای دیارخەرەکانی ناوەکەوە.**

**٢- ئەو جێناوە لکاوانەی، کە دەبن بە دیارخەری ناوو لە دوای کاری ڕستەکەوە دێن بریتین لە ( م ـ ین ، یت ـ ن ، (Ø) - ن ) لێرەدا، بۆ کەسی سێیەمی تاك، جێناوی لکاو لە دەوری دیارخەری ناودا دەرناکەوێت، ئەگەر کاری ڕستەکە لە دەمی ڕابردووی تێپەڕدا بێت.**

## ڕاهێنان(١)

جێناوە لکاوەکانی (ی ـ تـان) لـەناو ڕسـتـەدا بەکاربهێنـە بەمـەرجێك جارێـك ببنە بکەر و جارێکی تریش ببنە دیارخەری ناو.

## ڕاهێنان (٢)

١- کەی دەبێت ئەم جێناوە لکاوانە وەکو دیارخەری ناو بەکارهێنین؟

(ین -ت- ن - ی)

٢- کـەی جێنـاوی لکـاو وەکـو دیارخـەری نـاو لـە ڕسـتـەدا دەرناکـەوێت؟ وەڵامەکەت بە نموونەوە بسەلمێنە.

## ڕاهێنان (٣)

ئایا دەتوانین ببێژین؟

١- (مامۆستاکەت کیمیا زیرەکە)، یان نا؟ بۆچی؟

٢- گرێی (دەمەکانی منداڵەکە) دروستە یان دروست نییە؟ بۆچی؟

## ڕاهێنان (٤)

لە ڕستەی (دەبوو ڕۆمانە تازەکەتیان چاپکردبا).

١- بکەری ڕستەکە دەربهێنە.

٢- (ت) چـییە؟ ئـەرکی چـییە؟ بـۆ کەوتووەتـە ئـەوێ؟ لـەبری ئـەو (یـت) بەکاربهێنە ئنجا بزانە دەچێتە کوێ؟ بۆچی؟.

٣- (ە)ی دوای ووشەی (ڕۆمان) چییە؟

٤- ڕستەکە بگۆڕە بۆ شێوازی ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندن.

## سەرچاوەکان:


١– زمان و ئەدەبی کوردی ـ بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی چاپی هەولێر ـ ٢٠٠٢ز ـ ٢٧٠٢ کوردی؟

٢– د. ئاو رەحمانی حاجی مارف، رێزمانی کوردی بەشی (١ – ٥) کۆکردنەوەو لە چاپدانەوەیان لە یەك کتێبدا سلێمانی ـ ٢٠٠١,

٣– نوری علی امین، قەواعدی زمانی کوردی لە (صرف نحو)دا، بەغداد، ١٩٥٦,

٤– د. کوردستان موکریانی، سینتاکسی ڕستەی سادە لە زمانی کوردیدا، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی زنجیرە ژمارە ١٣٣,

٥– نوری علی امین، ئەرك و شوێنی ڕاناوە کەسییەکان لە ئاخاوتنی کوردیدا. ١٩٨٦.

# بەشی ئەدەب

## لیژنەی دانان

د. دلشاد علی محمد

انور علی قادر — محسن أحمد کریم

حمە یوسف عثمان — هۆشیار نامق دەروێش

احمد محمد رشید — سەگڤان جمیل محمد

هێرۆ عبد اللطیف یونس

## ڕێڕەوی شیعری کوردی لە ساڵی ( ١٩٣٩ - ١٩٩١)ز

ڕێـــڕەوی شـــیعری کـــوردی لـــەم ماوەیـــەدا بـــەپێی ڕووداوە ڕامیـــاری‌و ڕوناکبیرییەکانی نـاو کۆمـەڵگای کـوردی، دابـەش دەکرێـت بـۆ سـێ قۆنـاغی شیعری جیاواز هەوڵدەدەین لێرەدا بە شێوەیەکی کورت و چڕو واتـادار بـاس لەو قۆناغانە بکەین.

## قۆناغی یەکەم
## ساڵی ( ١٩٣٩ - ١٩٥٨)ز

شیعری کوردی لە قۆناغی پێشوودا هەنگاوی گەورەو کاریگەری نابوو، بـۆ هێنانەدی گۆڕانی گرنگو نوێ لە ڕوخسـارو نـاوەڕۆکی دەقـی شـیعریدا. ئـەم هەنگاوە پڕ گۆڕانکارییە، کاردانەوەی هەبووە بەسەر ڕێڕەوی شیعری کوردی لەم قۆناغەدا. بەجۆرێك دەکرێت ئـەو ڕاسـتییە بخەینـە پـێش چـاو کەبەشـی زۆری ئەو ڕەوتە نوێیـە لـە شـیعری ئـەم قۆناغـەدا دەبیـنین درێـژە پێـدەری هەمان ڕەوتی گۆڕانکاری شیعری کوردی قۆناغەکانی نوێکردنەوەی پێشـترە. چونکە لەم قۆناغـەدا ئـەوەی ئاشـکرابێت، ناکرێـت بـە شـێوەیەکی بنـەڕەتی هێڵی ئاشکراو دیاری جیاکەرەوە لە نێوان ئەم قۆناغەو قۆنـاغی پێشـوودا لـە بواری شیعردا دیاری بکەین.

وەك ئاشکرایە تایبەتمەندێتی شیعری زینـدوو ئەوەیـە کـە گوزارشـت لـە کاتی لە دایکبوونی و هەڵگری سـیماو تایبـەتێتی قۆنـاغی نووسـینی دەقەکـە بکات، بۆیە سـاتەوەختی پـەژارەو ژەنگـی سیاسـیی کـاتی جـەنگی دووەمـی جیهانی‌و خەباتی سیاسی‌و خۆپیشاندانەکانی کۆمـەڵانی خـەڵك لـە عـێراق بـە

گشتیو لە کوردستاندا بەتایبەتی بە ڕادەیەکی زۆر جێگەو شوێنەواریان بەسەر گۆڕانکارییەکانی شیعری کوردی لە قۆناغەکەدا بە جێهێشت.

لەم قۆناغەدا لەپاڵ پەیدابوونی هەندێك دەنگی تازە هەمان ئەو شاعیرانە دەبیسین کەلە قۆناغەکانی پێشوودا دەنگی ڕەسەنی شیعری کوردی بوون، بەڵام هەندێك گۆڕانکارییان بەسەر دەقە شیعرییەکانیاندا هێناوە.

سەرەڕای ئەو سەرنجو تێبینیانەی کە پێشتر ئاماژەمان بۆکرد لێرەدا گرنگترینی ئەو خاڵانە دەخەینە ڕوو کە لە ڕوخسارو ناوەڕۆکی شیعری ئەم قۆناغەدا بەرچاو دەکەون:

## یەکەم: لە ڕووی ناوەرۆکەوە:

ڕەنگـە گـۆڕانی گـرنگ لـە بـواری شـیعری کـوردی لـەم قۆناغـەدا لـە ڕووی ناوەرۆکەوە بوو بێت، چـونکە سـەرەڕای ئـەو خاڵـە هاوبەشـانەی کـە لەگـەڵ ناوەرۆکی شیعری کوردی قۆناغی پێشوودا دەبینین، گەلێك لایەنی جیاوازیش بەرچـاو دەکـەون کـە خاسـیەتی نـاوەرۆکی شـیعر لـە قۆناغەکـەدا دەخەنـە بەرچاو.....................

لـە ڕووی نەتەوایـەتیو نیشـتیمان پەروەرییـەوە، بـەهۆی سـەرهەڵدانی ئـەو ڕووداوە ڕامیارییە گرنگانەی بەسـەر کوردسـتانو ناوچـەکەدا هـاتن، هەسـتی کوردایەتی لەلای گەلی کورد ئاراستەیەکی تری وەرگرت لـە شـیعری کوردیـدا، چونکە خەباتە ڕامیارییەکـەی ئـەو سـەردەمە چـووە ناودەقـە شـیعرییەکان، بەمـەش نـاوەرۆکی شـیعری کـوردی زیـاتر ڕووی لـە شـیعری نەتەوایـەتیو نیشتمانیو ڕامیاری کرد، شیعر بووە هۆکارێك بۆ هوشیار کردنەوەی میللـەت لە پێناوی بەدەست هێنانی مافەکانیدا، شیعری کوردی قۆناغەکە بـە تـەواوی گوزارشتی لە خواستو هیوای میللەتی کورد کردووە دیارترین ئەو شاعیرانەی لەم بوارەدا بالادەست بوون.

(( زێوەر، پیرەمێرد، بێکەس، شێخ نوری شێخ سالح، دلدار، هـەژار، هـێمن، قانیع، گۆران، هەردی، جگەرخوێن، کامەران موکری، دیلان، ع. ح. ب))

هەندێك لەو شاعیرانەی کە ناومان هێنان وەك:

(( هەردی، کامەران موکری، دیلان،ع.ح.ب، جگـەر خـوێن، هـێمن، هـەژار)) لـەناو کـۆڕی خـەباتی ڕامیـاری ئـەو سـالانە هاتنـە نـاو جیهـانی شـیعری کوردییـەوە. لێـرەدا نموونەیـەك لـە شـیعری (هـێمن) دەهێنینـەوە، کـە بـە

شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەرخەری ئەو ڕاستییەیە کە هەستو نەستی کوردایەتی بە تەواوەتی شیعری کوردی قۆناغەکەی داگیرکردووە کە دەڵێت:

**گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و حەسرەتو دەردم ئەمن**
**قەت لەدەست ئەم چەرخە سپڵە نابەزم، مەردم ئەمن**
**ئاشقی چاوی کەژاڵ و گەردنی پرخاڵ نیم**
**ئاشقی کێو و تەلان و بەندەن و بەردم ئەمن**
**گەر لە برسان و لەبەر بێ بەرگی ئیمڕۆ ڕەق هەڵێم**
**نۆکەری بێگانە ناکەم تا لەسەر عەردم ئەمن**
**من لە زنجیر و تەناف و دار و بەند باکم نییە**
**لەت لەتم کەن، بمکوژن، هێشتا دەڵێم کوردم ئەمن**

(دوو دێر بۆ لەبەرکردنە)

هەروەها هەر لە چوارچێوەی بابەتی نیشتمان پەروەریدا (جگەر خوێن) دێتە گۆڕەپانەکەوە هەستی کوردانەی خۆی بۆ سەربەخۆیی و هەڵکردنی ئالای کوردستان دەردەبڕێت و دەڵێت:

## ئالامن

**ئالامن ڕەنگین پیروزی خوەش**
**تە هەڵدگرم دچم بمەش**
**تو لسەر ملێن خورتێن جان**
**د ناڤ تەدە یەك رۆژەك گەش**

**ئالا سێ ڕەنگی تو**
**بناڤ و دەنگی تو**
**نیشانا جەنگی تو**
**ئەی خورتێن کوردان سلاڤێ لێ بکەن**

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

هەروەك چۆن خەباتی گەلی کورد لە پێناوی سەربەخۆیی کوردستانو کێشە ڕەواکەیدا لە شیعری کوردیدا شوێنی دیاریان هەبووە، بەهەمان شێوە شاعیرانی کورد شیعریان بۆ خەباتو تێکۆشانی گەلانی تر لە پێناو سەربەخۆییدا نووسیوە، هەوڵیان داوە لە ڕێی ئەو شیعرانەوە پەیامی خەباتی هاوبەشی گەلانی چەوساوەو ژێر دەستە لە پێناو سەربەرزیو ڕزگاربوون لە کۆتی ژێر دەستەیی پیشان بدەن، واتا شیعری کوردی پەیامێکی مرۆڤایەتی هەڵگرتبوو، هەرگیز بە تەنها لە بیری نەتەوەکەی خۆیدا نەبووە تا بە ئاراستەیەکی ڕەگەز پەرستانەیدا بەرێت، بەڵکو شیعری کوردی کانیاوی بیری ئازادیخوازی گەلانی تری جیهانیش بووە.

لایەنێکی تری گرنگ لە ناوەرۆکی شیعری کوردی قۆناغەکە بریتییە لە باسکردنی سروشت. سروشت لە شیعری ئەم قۆناغەدا لەو وەسفە ڕووتەی کە لە شیعری کلاسیکدا بوونی هەبووە دەرباز بووە، بۆ ئەوە بووە کە هەستی ڕۆڵەکانی کورد بجوڵێنن لە پێناو دروستکردنی هەستی خۆشەویستی کوردستان لە ناخیاندا تا وڵاتەکەیان زیاتر خۆش بوێت. (دیلان)کە دیمەنی سروشتی کوردستان کاری تێدەکات و دەڵێت:

## بــەهـــار

**وابــەهـار دیــسان تـــارای ئـە پۆشێ**
**گــوڵاڵـە پــیاڵـەی خـوێنـــین ئەنـۆشێ**
**نێرگـس ئەندام شـۆڕ ڕەنـــگی زێـڕینـی**
**وەنەوشەو کوڕنــووش پەڕەی چـین چینی**
**هـاژە هـــاژەی ئـاو، هـــاڕەی شـەتـاوان**
**بــریــسك و هـــۆڕی نـــزارو کـــاوان**
**تریـقو هـــۆڕی خـونـچـــەی داری بـاخ**
**خـوێـندنی مـەلی قـەڵبـــەز و سەر شـاخ**
**دەنــگی شمشاڵو بەستەی دڵـــفڕێــن**
**تـەنگو چـەڵـەمەی زستان ڕاو ئـەنێن**

**( دوو دێر بۆ لەبەرکردنە )**

هەر لـەم قۆناغـەدا بابـەتێکی تـر لـە شـیعردا خراوەتـە ڕوو، ئـەویش بابـەتی جـوانی ئـافرەتو کێشـەکانی بـووە. شـتێکی ڕوونو بەرچـاو کەلەشـیعری کوردیدا(ژن) بەشو جێگەی گەورەی هەبووە بەڵام (ژن) لـە شـیعری کـوردی ئـەم قۆناغـەدا جیـاوازتر باسـی لێکـراوە. چـونکە باسـکردنی (ژن) تـەنها لـە چوارچێوەی جوانی ڕوخساریدا نەماوەتەوە بەڵکو لا لەکێشەکانی کراوەتەوە. شاعیران وا باسی (ژن) یان کردووە کە (ژن) وەکو پیاو مرۆڤە، وەکو پیاویش ئەرك و مـافی هەیـەو دەبێـت بەشـدار بێـت لـە کـۆڕی سیاسـیو تێکۆشـاندا، دەبێت ژنی کورد لە کۆتی دیلیو دواکـەوتوویيو هـەموو ئـەو داب و نەریتانـە ڕزگاری بێت کە دەرفەتی بەشداری بوون لە بوارەکـانی ژیانـدا بـۆ ژنـان لاواز دەکەنو ڕۆڵیان ناهێڵن.

(بێکـەس) بـاش ئـەم دیمەنـە دوا کەوتووییـە لـەناو کۆمـەڵگادا بەرجەسـتە دەکاتو دەڵێت:

**مەڵێ من کچم. تـۆش وەکو منی**
**موحـتاجی عیلمو فـەنو خوێندنی**
**مەجبـوری ئیـشو خـزمەتـکردنی**
**هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە**
**سەرپۆش فڕێ دە چ وادەی شـەرمە**

**( هەمووی بۆ لەبەرکردنە )**

ئەم چەشنە ئاوێتە کردنەی ژن لەگەڵ کێشە ڕامیارییەکاندا بووە هۆی ئەوەی کـە ڕەنگدانـەوەی ژن لـە شـیعری کـوردی قۆناغەکـەدا وەکـو خۆشەویسـت بەرتەسك ببێتەوە، هەر بۆیەش دەتـوانین بڵێین کـە دیـارترین شـاعیری ئـەم قۆناغە لـە بـواری شـیعری خۆشەویسـتی بـۆ (ژن) (ئەحمـەد هـەردی)یـە کـە دەڵێت:

**گـەرچی دڵـداری لـە خـاکی ئێمەدا ئەفسانەیـە**
**هـەر بە تـەنیا بـۆ کـوڕی خاوەن تەلار و عانـەیە**
**گـیانەکەم! ئەمـما دڵـی من لـەو دڵە شێتانەیــە**
**بێ ئەوەی هیچ شك بەرێ، کوژراوی ئەو چاوانەیــە**
**هەر بەتەنیا خۆشەویستی شك ئەبەم، ست فا تمــە**
**سەرووەتم نـاوێ، بــزەی تۆ ئــەو پـەڕی ئـاوا تمە**

**( دوو دێڕ بۆ لەبەرکردنە )**

دیارە کێشەی سەرەکی لە کۆمەڵگای کوردیدا لـەم ماوەیـەدا لـە پـاڵ کێشـە ڕامیارییەکاندا، بریتی بـوو لـە کێشـە کۆمەڵایەتییـەکان و، دیـارترین کێشـەی کۆمەڵایەتی لەم قۆناغەدا بریتی بووە لە کێشەی چینایەتی، شـاعیرانی کـورد

لەم قۆناغەدا زیرەکانە و وشیارانە ئاوێتەیان کردووە بە کێشەی ڕامیاری میللەتەکەیانەوە، دیاریشە کە سەرجەم دەقە شیعرییەکانی ئەم قۆناغە پاڵ پشتی چینی چەوساوە بوونو دژی زۆرداران وەستاونەتەوەو بەردەوام هاوڕێی جوتیار و کرێکاری زەحمەتکێش بوون. لەم بارەیەوە (قانیع) لە شیعری ( قەڵاچۆی دوژمن) دا دەڵێت:

**با هەموو جوتیار و پاڵەو ڕەنجبەران**
**یەکگرن تا دەبنە هێزو پشتیوان**
**هەڵگرن یەکسەر دروشمی هاوبەشی**
**بێ جیاوازی لەسەر ڕەمز و نیشان**
**هەڵگرن پاج و چەك و بێڵ و قەڵەم**
**هەر لە ڕۆشەنبیر هەتا شوان و سە پان**
**هەڵتەکێنن ئەم نیزامە بۆ گەنە**
**دابڕێژن کۆشکی یەکسانی ژیان**

**( دوو دێر بۆ لەبەرکردنە )**

بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت کە شاعیرانی کورد لەم قۆناغەدا ڕاستەوخۆ ڕوویان لە کێشەی ڕامیاری و نەتەوایەتی و چینایەتی کردووە. لەهەمان کاتیشدا بایەخیان بە ئاشتیو هاوخەباتی و مرۆڤدۆستی داوە.

## دووەم: ڕوخسارو تەکنیکی شیعری ئەم قۆناغە

ئەگەر چی لەم قۆناغەدا بایەخدانی شاعیران لە ناوەرۆك زیاتر دەبینرێ بەڵام لە ئاستی تاکە کەسیی شاعیران خۆیاندا چەند هەوڵێك دەبینرێ، کە بۆ گۆڕینو نوێکردنەوەی ڕوخسارو تەکنیکی شیعر دراون، وەك لە تاقیکردنەوە شیعرییەکانی (قەدری جان، گۆران، دیلان، کامەران)دا بەر چاودەکەون:ساڵی (١٩٥٤)دیلان لە پارچە شیعری (ڕێگای خەبات)ە کەیدا کە ناوی ناوە

پارچـەیەکی (مەنسـور) بنیـاتی دەقـی شـیعری کـوردی دەگۆڕێـتو بـەرەو قالْبێکی ئازادی دەباتو هەر لەم بوارەدا لە سالْی (١٩٥٧)دا کامەران مـوکری بـە پارچـە شـیعری (کچـە شـوان) ڕوو لـە شـیعری سەربەسـت دەکـات، بـە شێوازێکی نویْ مامەلْە لەگەلْ کێشو سەروادا دەکات.

## ئەی کچە شوان

ئـەی کـچە شـوان
هـەلاّلـەیـــی
ئـەی کـەنیزەی کەژی کوێستان
بە شـێنـەیـی
نـەرمو نیـــان
بـە ئـاوازی شـمشالْەکەت
بـە لەرەی لێـوە ئالْەکــەت
هەستی خۆشیـم بێنە فڕیـن
بۆ نـاو گـولْـزار
چـــەمو نـــزار

( هەمووی بۆ لەبەرکردنە )

بەلاّم دیارە ئەو هەولْە تاکە کەسییانە نـە لای ئـەو شـاعیرانە خۆیـان نـە لای شاعیرانی تری ئەم قۆناغـە بـەردەوام نـەبوو تـا بتـوانن بـە تـەواوی ڕێچـکەی شیعری سەربەست لە ئەدەبی کوردیدا بکەنەوە.

لایەنێکی تری روخساری شیعر کەلەم قۆناغەدا گرنگی پێدراوە زمانی شـیعرە کەبەرەو کوردی پەتی هەنگاوی بەرەو پێشـتری نـابوو، هـەروەها فەرهـەنگی شیعری ئەم قۆناغـە زیـاتر دەولْەمەنـد کـراوە، بـوارە جیاجیـا کـانی خـەباتی

ڕامیاریو شیعری جوانی سروشتو کێشەکانی ژنو دەیان وشەی تریان هێنایە ناو شیعری کوردییەوە.

هەر لەم قۆناغەدا بە سوود وەرگرتن لە فۆلکلۆری کوردی گەلێك لە شاعیران، زمانی شیعری ئەو قۆناغەیان دەوڵەمەندترکرد. (قەدری جان) یە کێك بوو لەو شاعیرانەی کە ئەم هەوڵەی لەلا بەدی دەکرێ.

**کاروانێ مە**

**ئەم هیچ نەوەستیاین، ناوەستین**
**لەسەر ڤێ ڕێیا دوور**
**سەر ڤێ ڕێیا دژوار**
**ئەم دچن و ئەمێ بچن**
**بەر ب ئارمانجا خۆ**
**ل بن باران**
**ل سەر بەرفان**
**باو با گەر ل شکەفتان**
**دبن دلۆپان**
**ب لنگی خاس**
**کاروانێ مە دچە**
**بە رب ئارما نجا خۆە**

**(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)**

هەر ئەو دەوڵەمەندییەی زمانی شیعر لە م قۆناغەدا لە لایەكو فراوان بوونی ئاسۆی بەردەم ئەندێشەی بووە هۆی ئەوەی کە وێنەی شیعریش گۆڕانی بەسەردابێتو زیاتر مەبەستی دەرِ بڕین لە بیرو هەست و سۆزی شاعیراندا بنیات بنرێت و بابەت و ناوەرۆکە شیعرییەکانیان پێ بەرجەستە بکرێ.

هەر لەم قۆناغەدا لەگەڵ فراوان بوونی خەباتی نەتەوایەتی گەلی کورددا (سروود)یش بەرەو پێشەوە چوونێکی بەر چاوی بە خۆیەوە بینی، بە تایبەتی ئەو سروودانەی کە بۆ جەژنی نەتەوەیی کورد ( نەورۆز) دەوتران لە شیعرە بە ناوبانگەکەی (پیرەمێرد)دا دەردەکەوێت کە دەڵێت:

**نەورۆز**

**ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە**
**جەژنێکی کۆنی کوردە بە خۆشی و بەهاتەوە**
**چەند ساڵ گوڵی هیوای ئێمەی پێ پەست بوو تاکو پار**
**هەر خوێنی لاوەکان بوو بە گوڵی ئاڵی نەو بەهار**
**ئەو ڕەنگە سوورەبوو کە لەئاسۆی بڵندی کورد**
**مژدەی بەیانی بۆ گەلی دوور و نزیك ئەبرد**
**نەورۆز بوو ئاگرێکی وەهای خستە جەرگەوە**
**لاوان بە عەشق ئەچوون بەرەو پیری مەرگەوە**

**( دوو دێر بۆ لەبەرکردنە )**

بەم جۆرە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە شیعری کوردی لەم قۆناغەدا بە شێوەیەکی گشتی لە ڕووی تەکنیك و ناوەڕۆکەوە هەڵقوڵاوی ناو جەرگەی کۆمەڵی کوردەواری بووە، واتە گوزارشتێکی ڕاستەقینەی لە ژیانی ئاسایی خەڵك کردووە. شاعیرەکانمان ویستویانە و مەبەستیان بووە، کە کۆمەڵانی خەڵك وشیار بکەنەوەو لە داواو مافەڕەواکانی خۆی بێدەنگ نەبێت، بۆیە بە زمانی ئەوان شیعریان و تووە، ئیدی بۆمان هەیە کە بڵێین شاعیرانی کورد لە زمانحاڵێکی بە وەفای میللەتەکەی خۆیان بوون و لە سەنگەری میللەت خۆیان جیا نەکردۆتەوە، ڕووداوە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکانی ئەم قۆناغەی گەلی کوردیان بەرجەستە کردووە...............

## قۆناغی دووەم

### ڕێڕەوی شیعری کوردی لە ساڵی ( ١٩٥٨- ١٩٧٠ )ز

دیارە ئەو مێژووەی سەرەوە پەیوەستە بە دوو ڕووداوی سیاسی گرنگ لە عێراقدا، یە کەمیان ساڵی ١٩٥٨ز ساڵی ڕوودانی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژە کە ئەم ڕوواوە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاردانەوەی بەسەرباری ڕووناکبیریو ئەدەبی گەلانی عێراق بە گشتی و گەلی کورد بە تایبەتی هەبوو. ڕووداوی دووەمیان لە ساڵی ١٩٦١ز دایە کە ئەویش بریتییە لە سەر هەڵدانی شۆڕشی ئەیلول کە ئەم ڕووداوە ڕامیارییە ڕاستەوخۆ بە شێوەیەکی دیار کارتێکردنی هەبووە لەسەر باری ڕووناکبیری و ئەدەبی کوردی لە کوردستانی عێراقدا.

شیعری کوردی هەر لە سەرەتای بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژی ساڵی (١٩٥٨)ەوە، ڕاستەوخۆ دەنگی خۆی خستە پاڵ ئامانجەکانی ئەم شۆڕشەوە بە هیوای ئەوەی کە لە سایەی شۆڕشدا کورد بە مافە ڕامیارییەکانی شاد بێت هەر ئەم تێڕوانینەش بۆ شۆرش لەو قۆناغەدا وای کرد کە شاعیرانی کورد دەیان پارچە شیعر بەسەر شۆڕش و سەرکردایەتی شۆڕشدا بڵێن، بەرگریان لەو دەسکەوتانەی کە شۆڕش بە دەستی هێنابوو، دەکرد بەم پێیە شیعری ڕامیاری ئەم سەردەمە ڕاستەوخۆ چووە ناو بازنەی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژەوە.

بەڵام وەك ئاشکرایە ئەو هیوایەی کە کورد بە شۆڕشی گەلاوێژ هەیبوو، هەر زوو پووکایەوە، چونکە بەرەبەرە پشت لە مافو خواستەکانی گەلی کورد کرا. لێرەدا دەتوانین بڵێین: شاعیرانی کورد هەر لە سەرەتاوە دەرکیان بەوپاشگەزبوونەوەیەی سەرکردایەتی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ کردبوو

بەرامبەر بە گەلی کورد، بۆیە دەبینین کۆمەڵێك دەقی شیعری کوردی لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی ڕابردوو دا ڕەنگ پێ دەرەوەی ئەو نائومێد بوونەی کورد بەرامبەر بە شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ دەردەخەن....

لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلولی ساڵی ١٩٦١ز دا، شیعری کوردی ڕاستەوخۆ چووە ناو سەنگەری پێشمەرگەوەو پتەوتر و سوورتر، جەختیان لەسەر مافە ڕامیاریو نەتەوەییەکانی گەلی کورد دەکردەوە. هەر بۆیەش سیمای هەرە دیاری ناوەرۆکی شیعری کوردی لەم قۆناغە مەبەستی ڕامیاری و نەتەوایەتی بووە. نموونەی ئەم بەشدارییە ڕاستەوخۆیەی شیعری کوردی لە شۆڕشدا شان بە شانی پێشمەرگە لەم شیعرەی (هەژاری موکریانی) دەردەکەوێت کە دەڵێت:

**نیشتمانی کورد، گەلێك پیرۆزی، سوێندت پێ ئەخۆم**
**بۆ سەر بەخۆییت بە گیان و بە ماڵ، بە قوربانی تۆم**
**زۆر لاوی ئازات، لە کۆڕی خەبات، خوێنی خۆیان ڕشت**
**زۆر شێخ و پیران، لە زانا و ژیران ، خۆیان دا بە کوشت**
**بۆتان، شەمزینان، چیای شیرین، پیران، ئاگری داخ، ساسۆن**
**دەربەند ، شارەزوور ، مهاباد سووری، ڕوگەی نەوەی تۆن**
**دڵ چاك و پاكین ، ئازاو بێ باكین، ڕۆڵەی ئەوانین**
**بەدڵ داوای سەربەخۆیی تۆو تۆڵەی ئەوانین**
**بڕیارمان وایە، یان ئازادژیان، یان ئازا مردن**
**بەسەرچوو ئەم دەم، لە ڕووی بێگانان سەرنەوەی کردن**

**( دوو دێری بۆ لەبەرکردنە )**

ئەم بایەخدانەش بە کێشەی نەتەوایەتی، نەك هەر نەبووە هۆی ئەوەی کە ئاسۆی بەردەمی شاعیران تەسك بکاتەوە، بەڵکو فراوانتری کرد و شاعیرانی کورد لە پاڵ ئاوڕدانەوە لە خەباتی نەتەوەکەیان باوەشیان بۆ خەباتی گەلانی تری ماف خوراو کردەوە، هەروەك چۆن کامەران موکری ڕوو لە شۆڕشی گەلی جەزائیر دەکات و (دیلان) پشتگیری (لۆمۆمبا)ی کۆنگۆ دەکات.

## فۆرم و تەکنیکی شیعر لە قۆناغی (١٩٥٨- ١٩٧٠) ز:

لەم قۆناغەدا بەهۆی ئەوەی بابەتی سەرەکی لە ناوەرۆکی دەقە شیعرییەکاندا مەبەستی رامیاری بووە، ئەوا زمانی شیعریش لە چوارچێوەی هەمان مەبەست دا دەسووڕایەوە، سۆزی شاعیران لەسەرەتای ئەم قۆناغەدا، واتە لە ماوەی نێوان سالآنی (١٩٥٨ تا ١٩٦١)ز هەڵگری سیمای خۆشی و شادی بووە بەرامبەر بە شۆڕش و ئومێدی بەدیهێنانی مافەکانی گەلی کورد بووە، هەر بۆیەش ئەو وشە شیعرییانە لەم ماوەیەدا دەقی شیعریان پێ دەنووسرا شادی و گەشبینی و ئومێدی تێدا دەبینرا.

بەلآم لە شیعری ماوەی نێوان سالآنی (١٩٦١ ـ ١٩٧٠)ز کە شۆڕشی ئەیلوول سەری هەڵدا، زمانی شیعر بەرگی خەم و پەژارەو نائومێدی پۆشی بە تایبەتی لە دەستە سالآنی سەرەتای هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلوول دا، چونکە لەم ماوەیەدا ڕژێم بەو پەڕی توندو تیژییەوە کوردی دەچەوساندەوەو کوردستانی کاول دەکرد. بەلآم دیاریشە کە خەباتی گەلی کورد و سەرکەوتنەکانی پێشمەرگە تیشکی گەشبینی پەخش دەکرد، هەر بۆیە زمانی شیعریش بەرەو هەڵگرتنی شەقڵی بەرەنگاربوونەوەو چۆك دانەدان

دەڕۆیشت، بەو پێیە شیعر لەم سەردەمەدا مەبەستی گەیاندنی پەیامەکە بووە، ئەوەندە مەبەستی دەرخستنی توانستی زمانی شیعری نەبووە.

لە ڕووی (کێش و سەروا)وە، شیعری ئەم سەردەمە وەکو قۆناغی پێشوو زیاتر کێشی بڕگەیی و سەروای مەسنەوی (جووت سەروا)ی پەیڕەو کردووە، لەگەڵ ئەمەشدا لای دیلان و قەدری جان شێوازی بەکارهێنانی سەروا تا ڕادەیەك گۆڕانی بەسەردا هاتووە و دەقە شیعرییەکان بەرەو بنیاتی شیعری سەربەست براون. بەڵام دیارە ئەم هەوڵانەی لەم سەردەمەدا لە پێناوی گۆڕینی قالبی دەقی شیعری دا نراون هەوڵی تاکە کەس بوون و نەبوون بە دیاردە، تەنانەت ئەو هەوڵە نوێگەرییەی کە لە تاقیکردنەوە شیعرییەکانی (سوارەی ئیلخانی زادە) دا دەبینرێن لە کوردستانی ڕۆژهەڵات دا هەر لە بازنەی هەوڵی تاکەکەسیدا مایەوە و نەبوو بە ڕەوتێکی دیاری شیعری کوردی لەم قۆناغەدا.

لێرەدا نموونەیەك لە شیعرێکی (گۆران) دێنینەوە کە لە ١٩٦٢/٦/١٢ بەر لە مردنی بە ماوەیەك نووسیویەتی لە ژێر ناونیشانی (بێشکەی منداڵ) تێیدا بە ئاشکرا سەروای تازە دەبینرێت کە شاعیر دژی شەڕو شەڕخوازان وەستاوەو لەگەڵ ئاشتی دایە....

## (بێشکەی منالْ)

دایـك دای ڕەنج، بـــۆ منـــالْ دای،
بـــۆ بـــــزەی ناو بێشکەی ئارام،
بـــۆ شیریـنی گــــــڕوگالْ دای...

*　　*

بـــاوك هــــەچ ئارەقێکی ڕشت
بـــۆ ئـــــەوەی ڕشت — من دڵنیام
نـــەمری کــــات: بـــڕبڕەی پشت...

*　　*

ئای ئـــەو مـالْـــە چـەن ئـــاوایە:
کـــە دایك و بــــاوك لای بێشکەدا،
گــــــوێیان لە مشەی ساوایــــــە!

*　　*

ئـــای ئـــەو مـــاڵە چـەن بێ، بـاکە:
کە لـــە بـــارووت و لـــە بۆمــــبـا
ژێـــر بـێشــکەی منالْیان پـاکـــە!

*　　*

ئـــای چـــەن خۆشە: ماڵێکی بـــێ وا
ڕووی دنیا، ئـــــەم پەڕ تا ئەو پـەڕی
دڵـــــنیا بـین بێـشـکەی ســـــاوا
نـــابـێ بــە خـۆڵـەمێـشی شـــەڕ

تەنیا دوو کۆپلەی دوایی بۆ لەبەرکردنە

# قۆناغی سێیەم

## ڕێرەوی شیعری کوردی لە ساڵی (١٩٧٠ - ١٩٩١)ز

قسـەکردن لەسـەر ڕێـرەوی شـیعری کـوردی ئـەم قۆناغـە لـە دوو مـاوەی جیاواز دایە بەم شێوەیە:

ئـ) ڕێڕەوی شیعری کوردی لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٧٠ ـ ١٩٧٥).

ب) ڕێڕەوی شیعری کوردی لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٧٥ ـ ١٩٩١).

### ڕێرەوی شیعری کوردی لە نێوان ١٩٧٠ — ١٩٧٥

شتێکی ئاشکرایە کە شیعری کوردی لەم قۆناغەدا لە ئەنجامی ئەو گۆڕانە سیاسـییە گرنگـەی بەسـەر کوردسـتاندا هـات، گـۆڕانی زۆری بەسـەردا هـات لەچاو ئەو گۆڕانانەی کە لە قۆناغەکانی پێشوودا ڕوویاندابوو.

ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٧٠ ـ ١٩٧٥) ماوەیەکی کـورت و کـەم خایـەن بـوو، بـەڵام تـابلێی گـرنگ و کاریگـەر بـوو هـەروەك کاردانـەوەی گـەورەی بەسـەر ئەدەبی کوردی بە گشتی و شیعری کـوردی بـە تایبـەتی بـە جێهێشـت، ئـەم گۆڕانەش ناوەڕۆك و ڕوخساری شیعری گرتـەوە.

دیـارترین سـیمای شـیعریی، لـەم قۆناغـەدا بریتـی بـوو لـە سـەر هەڵدانی گرووپـی (ڕوانگە) لـە سـاڵی (١٩٧٠)دا، ئـەم گرووپـە تـوانی ڕۆڵێکـی گـرنگ و کاریگـەر ببینێـت، لـەو گۆڕانانـەی کـە بەسـەر نـاوەڕۆك و فـۆڕمی شـیعری قۆناغەکە داهات، ئەو ڕۆڵەش لە شیعری کوردیدا تـا سـاڵانێکی زۆر بـەردەوام بوو.

شاعیرانی ڕوانگە هەڵگری تێڕوانینێکی جیاوازبوون بـۆ شـیعر، ئـەوان لـە پـاڵ ئـەو گۆڕانـەی بەسـەر فـۆڕمی شـیعردا هێنایـان، دەیانویسـت شـیعر پـەیامی

یاخیبوون بگەیەنێت، ئەم هەستەش بەجۆرێك بوو تێکڕای شیعری کوردی لەم قۆناغەدا گرتبووەوە، کە دواتر بە درێژی ئەم چەمکە لە شیعری کوردی ئەم قۆناغەدا دەدوێین.

## تایبەتمەندێتی شیعری کوردی لەم قۆناغەدا

### ئـ/ ناوەرۆکی شیعری کوردی لە نێوان سالآنی (١٩٧٠ ـ ١٩٧٥)دا

شیعری کوردی ئەم قۆناغە هەلگری گوتارێکی نەتەوەیی قوولّ بوو، کە ئەویش بریتی بوو لەو پەیامەی کە بەرگری دەکرد لە پێناوی پاراستن و مانەوەی نەتەوەی کورد دا، شیعر دژی جەور و ستەم و زۆرداری دوژمن دەوەستایەوە و لەم بوارەدا وەکو هێزێکی کاریگەر ڕۆڵی بینیوە، ئەم هەستە بەئەندازەیەك کاریگەر بووە کە ڕەنگە کەم شاعیری کورد لە قۆناغەکەدا ببینین کە شیعری بۆ کورد و سەربەخۆیی کوردستان نەنووسیبێت.

شیعر لە پالّ ئەو ناوەرۆکە باوەی کە شیعری کوردی قۆناغەکانی پێشووی پێ دەناسرێتەوە لە بابەتی وەك (خۆشەویستی) و (نیشتمانی)، گەلێك بابەتی نوێ لە شیعری ئەم قۆناغەدا بەرچاو دەکەوێ وەك بابەتی ﴿مرۆڤ و مرۆڤایەتی ـ ژیان و مردن ـ شارستانیەت ـ ژن وەك خاوەن کێشەیەك........هتد﴾.

هەروەها شیعری ئەم قۆناغە هەلگری بیری فەلسەفی و مەعریفی یە، بە تایبەتی لەو بیرە فەلسەفییانەوە سەرچاوەی دەگرت کە سەرچاوەکەی لە سەرچاوەی بیرە فەلسەفییەکانی ڕۆژئاواو هاوچەرخ بوو، ئەمە لە کاتێکدا شیعری کوردی لە قۆناغەکانی پێشوودا سەرچاوەی بیرە فەلسەفییەکانی لە کلتورە ڕۆژهەلآتییەکەوە وەرگیرا بوو.

یاخیبوون، دیاریترین خاسیەتی شیعری کوردی ئەم قۆناغە بوو، و لە بنەڕەتدا دوو جۆر یاخیبوون هەیە کە بریتین لە:—

**ئـ- يـاخيبوونى كۆمەڵايـەتى:-** كـە ئەمـەش يـاخيبوون لـە داب و نەريتـە كۆمەڵايەتييە باوەكان دەگرێتەوە....

**ب- يـاخيبوونى ڕاميـارى:-** ئـەم جۆرە ياخيبوونـەش لـە پێنـاوى ئـازادى و سەربەستى مرۆڤـ دايە.

(**لەتيف هەڵمەت**) كـە يەكێكـە لـە شـاعيرە ديارەكـانى قۆناغەكـە، بـە سـوود بينين لە ئەفسانە و هێما مێژووييەكانى ناو كلتورى نەتەوەى جيهـانى وێنـەى ئەم ياخيبوونە، پيشان دەدات و دەڵێت:-

**پێتـان ئەليْم .... ياخى بن ..... ياخى بن**

**لــــەم هــــەمـوو نــەخشە و باجـــــە**

**ياخى ببــن لەم مەيدانە ..... لەم گەراجە**

**كــــە مرۆڤ وەك ئــــامراز تيايا هەڕاجـــە**

**يــــاخى ببــن ....... ياخى ببـــــــن**

**لــــــەو قـــــەمـــــــــانـەى**

**كــــــە ســــوورى خــوێنى حەلاجـــــە**

**( هەمووى بۆ لەبەركردنە )**

فەلسەفەى ژيـان و مـردن يـەكێكى تـرە لـەو مەبەسـتە گرنگانـەى كـە لـە شيعرى قۆناغەكەدا بـوونى هـەبووە، لێـرەدا شـاعيرانى كـورد وەك بابـەتێكى گـرنگ لـەم مەسـەلەيە دووان، تێڕوانينـى هـزرى و فەلسـەفى خۆيـان لـەم بارەيەوە خستۆتە ڕوو، هەندێكيان ڕەشبينانە لە ژيانيان ڕوانيوە و بەشتێكى دەمامككراوى كاتييان زانيوە بـەڵام هەنـدێكى تريـان گەشـبينانە لـە ژيانيـان ڕوانيـوە و ڕووە گەشـەكانيان بەرجەسـتە كـردووە. هـەر بۆيـە پرسـيارە فەلسـەفييەكانى شـاعيران لـە چوارچـێوەى ژيـان و مـردن دابـوون و دواجـار

هـــەرخۆیان زۆر جـــار ڕەشـــبینانە وەڵامیـــان داونەتـــەوە، یـــاخود وەڵامـــی پرســـیارەکانیان بـــۆ خوێنـــەر بەجێهێشـــتووە. شـــێرکۆ بێکـــەس لـــە شـــیعری (گینگڵ)دا بەڕوونی تێڕوانینی خۆی دەربارەی ژیـان و مـردن دەخاتـە ڕوو و دەڵێت:

**دەمامکەکان هەڵبەنەوە ئەم شانۆیە هەرەس دێنێ**

**دەمامکەکان هەڵبەنەوە ئەم شانۆیە هەرەس دێنێ**

**بۆت ئەگەڕێم و نیوەشەو گۆڕ هەڵکەنی شاری خەوە**

**بۆت ئەگەڕێم و گومـــان ئەسپ سوارێکە هاتووە....**

**ئـــامـــادەبـــێ**

**لە ژوانی یەك ناسینی لە دایك بوون و مرد نما.........**

**ئەسپ سوارێکە هاتووە و نەهاتووە.........**

**سمکۆڵ ئەکا و دابین ئەبێ و دابین ئەبێ سمکوڵ ئەکا**

**جڵەو ئەگرێ و جڵەو ئەگرێ!**

***********

**ویستم ئەوە لە زەریایەك بگەیەنم**

**گەر جۆگەکان نەبن........ ناژی**

**خـــنکـــانـــدمـــی**

**ویستم ئەوە لە بروسکە بگەیەنم**

**گەر هەورەکان نەبن .....ناژی**

**ســـوتـــانـــدمـــی**

**تۆ کێی ـ تۆکێی؟**

**هەتاوێکم بەبێ ئاسۆ........**

**(تەنها دوا کۆپلە بۆ لەبەر کردنە)**

شاعیرانی ئەم قۆناغـە کـەمتر کەوتوونەتـە ژێـر کاریگـەری و کـارتێکردنی شاعیرانی پێش خۆیان واتـە لـە هـەوڵی ئـەوە دابـوون کـە لـە شـیعری ئـەوان لابـدەن، تـەنها لـەو کاتانـەدا سـوودیان لێ بینیـون کـە شـیعرەکانیان درێـژە پێدەری ڕەوتی یاخیبوونی ئەم شاعیرانە بووە، لەگەڵ ئەم بارەشدا کاریگەری شیعری ئەم قۆناغە بەسەر تەواوی شیعری ساڵانی دوای لە ئەدەبی کوردیدا دیارە.

## ڕوخسار و تەکنیکی شیعری کوردی لە نێوان ساڵانی (١٩٧٠ ـ ١٩٧٥) دا:

چۆن گۆڕان بەسەر ناوەڕۆکی شیعری کوردی ئەم ماوەیەدا هات بە هەمان شێوەش گۆڕان بەسـەر ڕوخسـاری شـیعری کـوردی قۆناغەکەشـدا هـات. کـە لێرەدا بەشێوەیەکی گشتی لە فۆڕم و تەکنیکی شیعری ئەم ماوەیە دەدوێین. وێنەی شیعر یەکێکە لە خاڵە هەرە بنەڕەتییەکانی ئـەو گۆڕانـەی کـە بەسـەر فۆڕم و تەکنیکی شـیعری کـوردی ئـەم ماوەیـە داهـات، وێنـەی شـیعری لـەم قۆناغەدا بە تەواوەتی خۆی دەرباز کردووە لە لاسایی کردنەوە و جوینـەوەی وێنـەی دووبـارە، لـە شـیعری ئـەم قۆناغـەدا گـەلێك وێنـەی شـیعری جـوان بـەکارهاتووە کـە سەرچـاوەکەی لـە ڕووداو و کارەسـاتە مێژووییەکـە و نەتەوەیی و جیهانییەکانەوە وەرگیرابوون. لە شـیعری ئـەم ماوەیـەدا وێنـەی ڕووتی ڕەوانبێژی تێدا بەکار نەهاتووە، بەڵکو وێنەی شیعری لەم ماوەیەدا لە پێنـاوی گەیانـدنی پەیامێکـدا بـووە و مەبەسـتێکی تایبـەتی لەگەڵـدابووە. هەرچی دەربارەی زمانی شیعریشە ئەوەی ئاشکرایە هیچ گۆڕانێك لە شـیعردا ڕوونادات بەبێ گۆڕان لە زمانی شیعردا، شیعر زمانێکی جیاوازی هەیە کـە لـە زمانی خەڵك جیاوازە. شاعیران لەم قۆناغەدا هەوڵیانداوە کە وشەکان لـە نـاو دەقە شیعرییەکاندا لە ئاماژە کۆنەکان دابڕن و ئاماژەی نوێیان بدەنێ، واتە

(واتای فەرهەنگی) لە وشەکان دادەماڵێت و واتای نوێیان پێ دەبەخشێ. ئەو گۆڕانە لە بەکارهێنانی وشەدا لەم ماوەیەدا بەڕادەیەکە کە زمانێکی خوازەیی پانتـایی دەقـی شـیعری داگـیر دەکـات. ئەمـەش وا دەکـات کـە وشـەکان راستەوخۆ واتا نەدەن بەدەستەوە. هەر بۆیەش زمـانی شـیعر لـەم قۆناغـەدا ئاڵۆزە و خوێنەری شیعر بە ئاسانی لە واتای وشەکان ناگات. هەر دەربـارەی زمانی شیعر لەم ماوەیەدا لە چوارچێوەی کـوردی پەتیـدا زمانـە شـیعرییەکە دەسوڕایەوە بەڵام بە ئاستێکی دەوڵەمەندتر و ئاڵۆزتر لە زمانی کوردی پەتی قۆناغەکانی پێشوو. لە پاڵ ئەم گۆڕانانەشدا گەلێك وشە و زاراوەی نوێ هاتە ناو زمانی شیعرەوە وەك وشە و زاراوەکانی ﴿ئەهریمەن ، ئاهوڕامزدا ، گیڤارا ، زەردەشت ، ئاڤێستا......هتد﴾ سەرەڕای ئەو ئاڵۆزییەی لە زمانی شیعری ئـەم قۆناغـەدا بەرچـاو دەکـەوێت، گـەلێك دەقـی شـیعری لـە شـیعری ئـەم قۆناغەدا دەبینین کە لە پێناوی گەیاندنی راستەوخۆی مەبەستی شیعرەکاندا بە شێوەیەکی سادە خراونەتە بەردەست. لایەنێکی تر لەم بابەتە کە گرنگـی زۆری هەیە بریتییە لە بەکارهێنانی (هێما و نیشـانە) لـە دەقـە شـیعرییەکاندا بەهێما و نیشانەی خۆماڵی و جیهانیەکانەوە.........

سـەبارەت بـە کـێش ، شـاعیرانی کـورد زیـاتر پـەیڕەویان لـە شـیعری سەربەست کـردووە لەگـەڵ کرانـەوە ڕێچکەکەشـدا دیـاردەی مامەڵـەکردنێکی جۆراوجۆر لەگەڵ چەمکی هۆنراوەی سەربەستدا سـەری هەڵـدا و بـووە هـۆی ئـەوەی کـە زۆرجـار هەرسـێ چـەمکی هـۆنراوەی سەربەسـت و بـێ سـەرواو پەخشانە شیعر تێکەڵ بکرێت، بۆیە بەمـەش تارادەیـەك بەرهەمـە چـاکەکانی شیعری سەربەست دەشاردرانەوە.

دیــاریترین شــەقڵی شــیعری سەربەســتی کــوردی دوای بڵاوبوونــەوەی بانگەوازی ڕوانگە لــەوە دابــوو ڕوویــان کــردە بــەکارهێنانی هەشــت برگــەیی و چواربڕگەیی.

بەڵام دەربارەی (ســەروا)ش بەهــەمان شــێوەی بــەکارهێنانی کــێش مامەڵــەی لەگەڵدا کراوە، چونکە نە ســەروای یــەکگرتوو نــە ســەروای (مەسنەوی) یــان بەکارنەهێناوە، بەڵکو بە شێوەیەکی ئازادانە مامەڵەی لەگەڵدا کراوە.

تــەکنیکی شیعری ئەم ماوەیە سوودی لە داستانە میللی و فۆلکلۆرییــەکانی ناو کلتــوری کــوردی و جیهــانی بینیــوە ئــەم ســوودبینینەش ڕاســتەوخۆ یــان ناراستەوخۆ بووە. خاڵێکی تــر لــە تــەکنیکی شــیعری ئــەم ماوەیــەدا بریتییــە لەوەی کــە وەك مرۆڤــ مامەڵــە لەگــەڵ شــتە بێگیانــەکان کــراوە و یــاخود بــە پێچــەوانەوە لەگــەڵ شــتە بێگیانەکانــدا وەك مرۆڤــ دواون. هەرچــەندە ئــەم حاڵەتــە بــە شــێوەی تــر لــە شــیعری (گــۆران) دا دەبینرێــت. ئــەم حاڵەتــەش بریتییە لەوەی کە شاعیر لــە جیــاتی ئــەوەی پاڵەوانــەکانی لــە مــرۆڤ دروســت بکات، پاڵەوانی دەقەکانی لە شاخ و دەشت و ئاو .... هتد دروست بکات.

لایەنێکی گــرنگ لــە شــیعری مــاوەی نێــوان ســاڵانی (١٩٧٠ – ١٩٧٥) کــە بــە شێوەیەکی گشتی لێرەدا باسی بکەین بریتییە لە پەیدابوونی دەنگی شــیعری شاعیرانی ژن کە لە ڕوو پەڕی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو ڕۆژگارەدا دەبینرێن، کە کاریگەری ئەم دەنگانە لە قۆناغی دواتری شیعری کوردیــدا دەردەکــەوێت کە بووە هەوێنی لە دایکبوونی گەلێك دەنگی زیندووی ژنە شاعیرانی کورد لە ســاڵانی دواتــردا، نموونــەی ئــەو ژنــە شــاعیرانەی لــەم ماوەیــەدا شــیعریان دەنووسی (دایکی سۆلاڤ، ئەرخەوان، شەونم بەرزنجی، دایا جوان........).

## شیعری کوردی لە نێوان ساڵانی (١٩٧٥- ١٩٩١)ز:

شیعری کوردی لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٧٥– ١٩٩١) هەندێك لایەنی جیاوازی تێدایە لە چاو شیعری کوردی لە ماوەی ساڵانی (١٩٧٠– ١٩٧٥) بۆیە دەبێت بە شێوەیەکی جیاو تایبەت باسی بکەین.
ساڵی ١٩٧٥ شۆڕشی کورد تووشی نسکۆیەکی گەورە هات، ئەم نسکۆیە ڕاستەو خۆ کاردانەوەی هەبوو بەسەر باری ڕوناکبیری کوردی بە گشتیو شیعر بەتایبەتی، لە دەر ئەنجامی ئەمەوە گەلی کورد بۆ ماوەیەك تاساوە، نووسەرانیش ماوەیەك بەدوای وەڵامێکی مەنتیقی هۆکارەکانی ئەم ڕوداوەدا وێڵ بوون. هەر لەگەڵ دەست پێ کردنەوەی شۆڕشدا شیعر وەك چەکێکی کارتێکەر گڕی سەند.
شۆڕش لە کاتێکی دژواردا سەری هەڵدایەوە کە پێویست بوو بە هەموو شێوەو شیوازێکی خەبات بەشداری تێدا بکرێت یەکێك لەو شێوازانەی کە شۆڕش دەرکی پێ کردبوو ئەدەب بە گشتیو شیعر بە تایبەتی بوو.

لێرەوە شیعر بووە هۆکاری ڕەت کردنەوەی واقیعو زیندوو کردنەوەی هۆشیاری نەتەوەیی و شان بە شانی تفەنگ لە دژی دوژمن لە سەنگەر دابووە. چونکە نەدەکرا لەو سەردەمەدا کە سەردەمی بەرەنگار بوونەوەو لێپرسراوییەتی بوو شاعیران بێدەنگ بن، بەڵکە دەبوو ڕۆڵی پێشڕەویی لە شۆڕشدا بگێڕن ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە شیعر بەرەو بەرەنگار بوونەوەی ڕاستەوخۆ بچێت لە بیرو مەبەستدا، واتە جارێکی تر شیعری بەرەنگاریی لە ئەدەبی کوردیدا بوژایەوە، ئەم جارەیان شیعر درێژەی بە شەڕی ڕەوای کورد دەداتو بەرەنگار دەبووەو ڕەتی کردەوەو نەفرەتی لە دوژمن دەرکرد و واقیعی دەگۆڕیو هەوڵی دەدا سەر لە نوێ کۆمەڵگای کوردی شۆڕش گێڕ بنیات بنێتەوە. چونکە لە م قۆناغەدا شیعری کوردی

ئەركی گۆڕا بۆ بەرەنگاری، شیعری بەرەنگاریش بریتییە لەو جۆرە شیعرە کە درێژە بە شەڕ دەدات و بەرەنگار دەبێتەوەو ڕەت دەکاتەوەو دەگۆڕێتو سەر لە نوێ بنیات دەنێتەوە. شیعری بەرەنگاری لەم قۆناغەدا ئەو شاعیرانە دەیان نووسی کە:

ئـ– ڕاستەوخۆ بەشداری شۆڕش بوون.

ب– لە ناوەوەی کوردستان بوون بەڵام ناڕازی بوون لە دوژمن.

پ– ئەو شاعیرانەی لە دەرەوەی کوردستان دەژیان.

نمونەی شیعری بەرەنگاری لەم شیعرەی (**ئەنوەر قادر محمد**) دا دەردەکەوێت.

**خۆمن چەمە زستانە نیم، هەر هاوین هات هەڵپڕوکێم**
**ئەستێرە نیم، شەونەبێ نەتوانم بفڕم**
**خۆریش نیم، بەباڵەوە لەڕۆژدا ئاسمان تەی کەم**
**چۆن کپ ئەبم!**
**بەڵام گیانە هەر کەویستم تەنیا شیعرێ بۆتۆ بڵێم**
**لێزمەی فرمێسك بوو بە دێرو بوو بە سنووری**
**وڵاتێ ناویان نا وڵاتی گریان**
**کە ئەنووسم، ئەبم بە پۆستە بەری تۆ**
**نامەی شادی بۆ ئاوارەی ناو شەقامو باخچەی هەموو**
**شارەکانی دونیا دەبەم**

**( هەتا کۆتایی ( چۆن کپ ئەبم ) بۆ لەبەرکردنە )**

ئەم واقیعی سیاسییە تاڵەی قۆناغەکە وای نەکرد کە شیعری کوردی بەرەو ڕەشبینی بڕوات، بە ڵکو بەردەوام هیوای بە ئایندەیەکی گەش بووە، هەر بۆیەش شاعیرانی کورد بە چاوی ئومێدەوە بۆ ئایندەیان ڕوانیوە،

بەگـەش بینییـەوە ئاسـۆی ڕووناکیـان لـە ئاسمـانی کوردسـتاندا بینیـوە، (**مونەیـەد تـەیب**) کەلـەم ماوەیـەدا بـە شـێوە زاری کرمـانجی ژوورو شـیعری نووسـیوە، هیوایـەکی گـەورەی بەپاشـە ڕۆژێکـی مـەزن هەیـە، زوڵمـی زۆری دوژمن چۆکی پێ دانادات و سەربەرزانە دەڵێت:

**سبە دایێ**

**پێلاڤا من ......**

**ژتـاجا میری بلند تـرە**

**داوەتـا من......**

**ژهەمی گۆڤەندا خۆشترە**

**بەژنو بـالا من ......**

**ژبوهاریێ ب خەملترە**

**ئەڤجا چاوا دێ کەی گری؟**

**سینگێ خۆییێ تەمەت دەریا**

**دێ ڤە قوتی؟**

**پرچا خۆ یاوەکی بەفرێ**

**دێ ڤەچڕی؟**

**نەدایێ نە!**

**نەکەی نەکەی!**

**جل و بەرگێت خۆ ڕەش بکەی**

**دەرگەهێ کولکێ مەیێ خۆش**

**بۆ خەمو نیهارا ڤەکەی**

**( هەمووی بۆ لەبەرکردنە )**

به شێوەیەکی گشتی شیعر لەم ماوەی نێوانی سالان (١٩٧٥- ١٩٩١) دوودەستە شاعیر دەیان نووسی، دەستەیەکیان هەر ئەو شاعیرانە بوون کە دەنگی دیاری ماوەی نێوان سالانی (١٩٧٠- ١٩٧٥) بوون لە وانە ( شێرکۆ بێکەس، عەبدوڵلا پەشێو، لەتیف هەڵمەت، عەبدولرەحمان مزوری، رەفیق سابیر، خەلیل دهۆکی، ئەنوەر قادر جاف، جەمال شارباژێری، جەلال میرزا کەریم، دڵشاد مەریوانی...... هتد)

دەستەیەکی تریان بریتی بوون لە وانەی کە دواتر لە شیعری کوردی دا شوێنی خۆیان گرتو بوونە دەنگی دیار لەوانە (ئەنوەر مەسیفی، هاشم سەراج، جەمیل رەنجبەر، قوبادی جەلی زادە، جەمال غەمبار، موئەیەد تەیب، سەعدولا پەرۆش، کەریم دەشتی، محەمەد عومەر عوسمان، فەرەیدوون عەبدول بەرزنجی، جەوهەر کرمانج...... هتد).

وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد ناوەرۆکی شیعری کوردی لە ماوەی نێوان ئەم سالانەدا زیاتر ناوەرۆکێکی بەرەنگارییانەی هەبووە، بەلام لە چوار چێوە بەرەنگاریەدا گەلێك بابەتی لەخۆ گرتووە وەك ئەوەی شیعر دەبێتە هۆکارێ بۆ شکاندنی ترس لە دوژمنو بەرزکردنەوەی ورەی مرۆڤی کورد بەرامبەر بە دوژمنو بەخشینی هیواو ئومێدی سەرکەوتن بە خەڵکی، کە شکستی شۆڕشی ئەیلوول تارادەیەك ئەو هیواو ئومێدەی بەرەو کزی بردبوو، بەلام شیعر وەك هۆکارێکی بەهێزی ڕووناکبیری توانی بەشدارییەکی کارابێت لە بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلی کورداو هاوکاری پێشمەرگە بووە لەسەنگەری بەرگریدا.

هەربۆیەش پێشمەرگە وەك داینەمۆی شۆڕش شەهید وەك هێمای قوربانی دانی کوردو کوردستانیش وەك مەڵبەندی ژیانو خاکی پیرۆزی نەتەوە بوونە سێ توخمی سەرەکی شیعری بەرەنگاری. شەهید **(جەمیل رەنجبەر)** لەم

ڕۆژگارەدا کە خۆی پێشمەرگەو شۆڕشگێڕ بوو بە نوکی خامە لەمەیدانی بەرەنگاری دەنووسێت و بە ورەیەکی بەرزو گەشبینیەکی زۆرەوە دەڵێت:

**ڕووبارێکی خوێناوی**

**ئەو بڕیارەی دروێنەی خەوی کردم**

**مەلی هەژار**
**لە فرگەی ژان هەڵدەنیشێ**
**پێشمەرگەی لێ دادەبەزێ**
**هەرچی کانیاوی سەنگەرە**
**بۆ ڕووباری بەهاری دەزێ**

* * *

**بڕیار وایە**
**بەهار بێت و**
**دەیان چەپکە نێرگزی جوان**
**لەسەر گۆڕی شەهید بڕوێ**
**بڕیار وایە**
**خوێنی ڕژاو**
**لە ڕووباری سەروەریدا**
**خوڕەی نەمردنی نەنوێ**

* * *

**بڕیار وایە**
**کۆتری دەنگی شوانەکان**
**لەقەد پاڵی شمشاڵێکا**

**فوو بکاتە جۆگەلەی دێ**

**بڕیار وایە**

**تــەوری دەسـتی خـۆری بەیـــان**

**گڕ بەرداتە بـارە داری زستانی شەو**

**بڕیار وایە**

**کۆتــری دەنگی شوانەکــان**

**لە دۆڵەکان شۆڕ ببێتەوەو**

**سواری رووبـاری خوێن ببێ**

١٩٧٩/١٢/٢٩

**( کۆپلەی یەکەم لەبەردەکرێت )**

دوژمن لەم ماوەیەدا هەموو ڕێگاکانی قەڵاچۆکردنی کوردی گرتبـووە بـەر یەکێك لەو کـارە دڕندانـەی کـە بەسـەختی لـەم ماوەیـەدا درێـژەی پێدا، لـە پرۆسـەی نەگریسـی ڕاگواسـتنی کـورد لـە ناوچـەکانی خۆیـانو نیشـتەجێ کردنیانو لەو شوێنانەی کە خۆی مەبەستی بوو.

سیاسەتی پاکتاوی نەژادی کورد لە ساڵانی هەشـتای سـەدەی ڕابـردوودا گەیشتە لوتکە بەوەی دەستی دایە ئەنفال کردنی کوردو کیمیا بـاران کردنـی هەڵەبجەو ناوچەکانی کوردستان، ئـەم کردەوانـەی دوژمـن بـە قێـزەون تـرین کاری جینۆ ساید دادەنرێت لە مێژووی هاوچەرخی کوردو ناوچەکەو جیهانـدا. هەربۆیەش شیعری کوردی هەوڵی داوە لە ئاست خەمی پڕ ناسۆری گەلەکەیدا بێتو، ئەم کارەساتانە ببنە هەوێنی دەقـە شـیعرییەکان هـەروەها شـاعیرانی کورد ویستیان لە ڕێگەی شیعرەوە هاواری کورد بۆ ڕای گشتی بەرزبکەنەوەو داوایان لە گەلانی ئازادی خوازی جیهان کردووە کە پاڵپشتی گەلی کورد بن لە پێناوی بەدەست هێنانی مافەکانیاندا.

ئەوەتا بۆ مەرگبارانی هەڵەبجە **(جەوهەر کرمانج)** بە نوکی خامەی شیوەن دەکات بۆ ئەم تاوانە کەم وێنەیەی مێژووی مرۆڤایەتی دەڵێت:

## (هەڵەبجە دووەم هاتن)

**هەڵە بجە... بێشکە و جولانەی**
**ئەحمەد موختار، و، گۆران، بوو**
**هەڵە بجە...**
**جێگا نەزرگەی ئاشقان بوو**
**هەڵە بجە تاجی سەروەری**
**شەهیدانی کوردستان بوو**
**هەڵە بجە...**
**هەڵگری ئالای نەبەزینی**
**بیست و پێنج ملیون ئینسان بوو**
**کە هەڵە بجە شەهید کرا**
**کوردستانی گەورە گریا**
**کەهەڵە بجە ... دەهەزار چاو**
**دەهەزار مەچك و بازووی**
**بوون بە ئەڵقە و**
**داگیرکەر کردیانە پەنجە**
**ئەشکی چاوان بوون بەدەریا**
**ئاسمان گریا**
**زەوی گریا**
**دیوانی مەولەوی گریا**
**

**(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)** **١٩٨٨**

شـيعری کـوردی لـە مـاوەی نێـوان ئـەم سـاڵانەدا جگـە لـەو ڕۆحـە بەرەنگارییەی کەپێی دەناسرێتەوە جوانترین شـیعری بـۆ ژن و مەبەسـەکانی تری شیعر نووسیوە، لە خاسیەتو سیمای تایبەتی وا نووسـراون کـە لەگـەڵ ڕەوتی بەرەو پێشەوە چوونی شیعری کوردی لە قۆناغەکەدا بگونجێنێ. لـەم لایەنەشـدا دەنگـی شـاعیرانی وەك (محەمـەد عومـەر عوسمـان، فەرەیـدون عەبدول بەرزنجی، قوبادی جەلی زادە، دلاوەر قەرەداغی، جـەمال غـەمبار.... هتد) دەبینرێت.

هـەر لـەماوەی نێـوان سـالانی (١٩٧٥– ١٩٩١) دا لـە ئـەنجامی چـوونی شاعیرانی کورد بۆ دەرەوەی کوردستان بەهۆی زەبرو زەنگی دوژمنەوە ئـەم شاعیرانە ئاشنابوون بە شیعری گەلانی تر، ئەمەش زەمینەیەکی گونجـاو بـوو بۆ نزیك بوونەوە لە ڕۆشەنبیری جیهان، هەر ئـەم تێکـەڵاو بوونـەش وای کـرد کە شیعری کوردی لەم ماوەیەدا تاماوەیەك کەوتـە ژێـر کـارتێکردنی ئـەدەبی ڕۆژ ئاوا، ئەم کارتێکردنەش بە ئاشکرا بە شیعری دوای ئەم قۆناغەوە دیارە.

ئەو شاعیرانەی لە دەرەوەی کوردستان دەیان نووسی زیاتر هەستێکی پڕ لە خۆشەویستییان بۆ کوردسـتان هـەبووە بەتایبـەتی هەسـتی گەڕانـەوە بـۆ خاکی پیرۆزی کوردستان لە دەقی شاعیراندا ڕەنگی داوەتەوە، هـەر ئەمـەش وادەکات کە بڵێین یەکێك لە سیمادیارەکانی شیعری ئەم ماوەیە سـەرهەڵدانی هەسـتی نـامۆ بـوون و غـەریبی شـاعیرانە کـە لـە ڕێـی شـیعرەکانییانەوە گەیاندویانەتە کوردستان، (**عەبدوڵلا پەشێو**) یەکێکە لـەو شـاعیرانەی کەهـەر لەسەرەتای ساڵانی (حەفتا)ی سەدەی ڕابردوو کوردستانی بەجێهێشتووە لـە شــیعری (ســەربازی ون) دا کــە لــەدەرەوەی کوردســتان ســاڵی (١٩٧٨) نووسیویەتی هەستی پـڕ تاسـەی بەرامبـەر بـە خـاکی کوردسـتان و ژمـارەی زۆری شەهیدانی کوردستان دەردەبڕێتو دەڵێت:

## سەربازی ون

کـــــە وەفدێ دەچێتە شوێنێ،
بـــــۆ سەرگۆڕی سەربازی ون،
تـــاجە گوڵێــنەیــەك دێــنێ،
ئەگەر سبەی
وەفدێك بێــتە وڵاتی مـــن،
لێم بپرسێ :
کـــــوانێ گۆڕی سەربازی ون،
دەڵێم :
گەورەم!
لە کەنـــاری هـــەر جـــۆگەیـــێ،
لــــەسەر سەکۆی هەر مزگەوتێ،
لـەبەر دەرگـــای هەر مـــاڵـــێ ،
هەر کلـــێسەیـــێ،
هەر ئەشکەوتـــێ،
لـــەسەر گـا بەردی هەر شاخێ،
لــەسەر درەختی هـەر بـاخـــێ،
لەم وڵاتە :
لـــــەسەر هەر بستە زەمینێ،
لـــــە ژێر هەر گەزە ئاسمانێ،
مـــەترسە کەمێك سەرداخەو
تـــاجە گوڵێنەکـەت دانـــێ!

٥/ ١١/ ١٩٧٨ — مۆسکۆ

( هەمووی بۆ لەبەر کردنە )

# ڕەخـــنەی ئـــەدەبـــی

## وشەی (ڕەخنەو) چەمکی (ڕەخنەی ئەدەبی):

لـە زمـانی کوردیدا وشـەی ڕەخنـە بەرانبـەر وشـەی (نقد)ی عـەرەبیو وشـەی( کریتیـك) لاتینـی بـەکار دەهێنـرێ. هەرسـێ وشـەکەش لـە بـواری ئەدەبیدا بۆ یەك واتاو مەبەست بەکاردەهێنرێن و هـەڵگری چـەمکێکی دیاری کراون. ڕەخنەی ئەدەبی لەپاڵ مێژووی ئەدەبو تێوری ئەدەبدا دەبنە سـێ لقـی لێکۆڵینـەوەی بەرهـەمی ئـەدەبی واتـە ڕەخنـەی ئـەدەبی لقێکـی لێکۆڵینەوەی ئەدەبییە و بایەخ بە لێکۆڵینەوەی بەرهەمی ئەدەبی دەدات..

ئەرکی ڕەخنە شـیکردنەوەو ڕاڤـەکردنو هەڵسـەنگاندنی دەقـی ئـەدەبی یـان دیاریکردنی بەهای دەقی ئەدەبییە واتە ڕەخنەی ئەدەبی لەو بنـەما هونـەری و بیریانە دەکۆڵێتەوە کە دەقی ئەدەبییان لێ بنیات دەنرێ و بـە شـێوەیەکی زانستانە بەهای ئەو بنەمایانە دیاری دەکات، بەمەش ڕادەو ئاسـتی گرنگـی و بایەخی دەق بۆ خوێنەرو داهێنـەریش دەستنیشـان دەکـات، بۆیـە دەتـوانین بڵێین ئەگەر ئەدیبان بەرجەستەکەری جوانیو ڕەنـگ پێدەرەوەو ڕەنـگ ڕێـژ کەری ژیانو دەروونی مرۆڤـ بن ئەوا ڕەخنەگران بۆخۆیـان بزوێنـەری چـالاکی ئەدەبیو بزووتنەوەی ئەدەبیو داهێنانی ئەدەبین.

بەو پێیە دەبێ (ڕەخنـەگر) لێکۆڵـەرێکی ئـەدەبی شـارەزا بێـتو زانیـاری تەواوی دەربارەی مێژووی ئەدەبو تێوری ئـەدەبی میللەتەکـەیو میللـەتانی تر هەبێتو سەرباری ئەوەش کە چێژ لێوەرگرێکی ئەدەبیشە دەبـێ زانیـاری لە بـوارە جیاجیاکـانی ژیـانی سیاسـیو کۆمەڵایـەتیو ئـابووریو ڕۆشـنبیریدا هەبێتو شارەزاییەکی گشتیشی لەزانستە مرۆییو زانستەکانی دیکە هەبێت.

## مێژووی ڕەخنەی جیهانی :

لە مێژووی ڕەخنەی جیهانیدا دوو ڕێڕەوی ڕەخنەیی بەدی دەکرێن کە بریتین لە : ڕەخنەی ڕۆژئاوایی‌و ڕەخنەی ڕۆژهەلاتی، ئەو دوو ڕێڕەوە ڕەخنەییەش وەك چۆن تایبەتمەندی خۆیان هەبووە بەهەمان شێوە کاریگەریشیان لەسەر یەکتر هەبووە.

## ڕەخنەی ڕۆژ ئاوایی :

سەرەتای ئەم ڕێڕەوە ڕەخنەییە دەگەڕێتەوە بۆ پێش زایین و لە ئەدەبی یۆنانییەوە دەستی پێکردووە

یەکەم هەنگاو لەو ڕێڕەوەدا کاتێ بەدی هاتووە کە لەکاتی ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی جەژنەکانییانەوە شانۆگەرییان پێشکەش کردووەو لیژنەیەکیان بۆ هەڵبژاردنی باشترین دەقی تراجیدی یان کۆمێدی کە بەشیعر بووە دەستنیشان کردووە. جا هەڵبژاردنی باشترین دەق لەلایەن ئەو لیژنەیەوە بۆ خۆی چالاکییەکی ڕەخنەیی بووە چونکە بەپێی چەند پێوانەیەکی هونەری‌و بیری دەقەکانیان هەڵبژاردووە هەر لەو ماوە مێژووییەدا، واتە سەدەی شەشەمی پێش زایین، شاعیرێکی یۆنانی کەناوی (ئەرستۆڤانیس)بووە، لە بەرهەمێکی کۆمێدی خۆیدا بە ناونیشانی (بۆقەکان) ڕاو بۆچوون و تێڕوانینی ڕەخنەیی دەربارەی سێ شاعیری گەورەی یۆنانی خستووەتە ڕوو، ئەو سێ شاعیرەش (یوربیدز)و(ئەسخیلۆس)و(سوفوکلیس) بوون. لەگەڵ بوونی ئەو چالاکییە ڕەخنەییانەشدا دیارترین ڕێچکەی ڕەخنەی ئەدەبی لەلای یۆنانییەکان لەلایەن فەیلەسوفەکانەوە کرایەوە دیارترین فەیلەسوفیش کە بیروڕاکانیان تا ئێستاش جێگای بایەخ پێدان بن (ئەفلاتوون)و(ئەرستۆ)ن.

(ئەفلاتوون)ڕای وابووە کە شاعیران ناتوانن ڕاستییەکان بگەیێنن بە خەڵکی و لەبری ئەوەی چاکەیان فێرکەن هەڵیان دەخەڵەتێننو دەروونیان تێك دەدەنو وایان لیَ دەکەن کە جڵەو بدەنە دەست هەستو سۆزیان نەك ئەقڵیان.

هەرچی (ئەرستۆ)بوو ئەوا ئەمیان بە پێچەوانەی (ئەفلاتون)ەوە بەرهەمی شیعری بەسوودمەند داناوە، بەتایبەتی تراجیدیا کە بەلایەوە دەتوانێ دەروونی بینەر لە هەردوو هەستو سۆزی ترس و بەزەیی پاك بکاتەوە.

هەر (ئەرستۆ)لەو بەرهەمەیدا کە بەناوونیشانی (هونەری شیعر)ە کۆمەڵێ دەستوور و یاسای هونەری بۆ تراجیدیا دارشتووە کە بوونەتە بناغەی تێوری ڕەخنەی ئەورووپی بەگشتی و بوونەتە بنەمای ڕەخنەی کلاسیکی نویَ کاتێ وەك ڕێبازێکی ئەدەبی لەسەدەی حەڤدەدا لە فەرەنسا سەری هەڵداو گەشەی کرد.

لەو سەردەمەدا ڕەخنەگرێکی بەناوبانگی فەرەنسی کەناوی (بوالو)بوو ڕاوبۆچوونەکانی (ئەرستۆ)ی جێگیر کردو کردنیە پێوانەی ڕەخنەی کلاسیکی نویَ لە ئەوروپادا، هۆی ئەمەش ئەوەبوو کە ڕێبازی کلاسیکی بۆخۆی لە ئاکامی بوژاندنەوەو لاسایکردنەوەی بەرهەمی یۆنانییەکان و ڕۆمانییەکان سەری هەڵداو.

گرنگترین بنەماو پێوانەی ڕەخنەی کلاسیکی نویَ بریتی بوون لە: جڵەو دانە دەست ئەقڵ و ژیریو دوورکەوتنەوە لە هەستو سۆز و دەربڕینی کەسی و بایەخدان بە چێژی دروست و گرنگیدان بە بەها مرۆڤایەتییە گشتییەکان.

لەدووای (ڕێبازی کلاسیکی)یش کە (ڕێبازی ڕۆمـانتیکی) لـە ئـەورووپا سـەری هەڵـدا پێوانـە ڕەخنەییـەکانی ڕێبـازی کلاسـیکی ڕاسـتەوخۆ ڕەت کرانـەوە، بەڕادەیـەك کـە دەتـوانرێ بوترێـت ئەگـەر پێوانـەکانی ڕەخنـەی کلاسـیکی هەڵگێڕێنەوە ئەوا پێوانەکانی ڕەخنەی ڕۆمانتیکمان دێتە بەردەست.

بەو پێیە دیارترین پێوانە ڕەخنەییەکانی ڕێبازی ڕۆمانتیکی بـریتین لـە: بایەخدان بە هەست و سۆزی کەسیو دوورکەوتنەوە لە ئەقڵو گرنگیدان بـەو بەهایانەی کە کەسینو بەلای تاکە کەسەوە گرنگن، لەم ڕووەوە نووسـەرێکی ڕۆمانتیکی فەرەنسی کە (ئەلفرید دی موسێ)یە دەڵێ: (( ئەوەی گـرنگ بێـت بەلای منەوە ئەوەیە کە گوێ نەدەمە ئەقڵ))، ئەمە لە کاتێکدا کـە (بوالـو)ی ڕەخنـەگری کلاسـیکی بـوو وتوویـەتی: ((هەمیشـە بـەدەنگ ئەقڵـەوە بچـۆو لەوەوە یەکێتی بەرهەمەکانت بەدەست بهێنە))

دیـارترین ڕەخنــە گـری ڕێبــازی ڕۆمــانتیکی (مــەدام دی سـتال) و (سـانت بیڤ)بوون، بەلای یەکەمیانەوە دەبێ دەقی ئەدەبی ڕەنگ پێدەرەوەی ژیانە کۆمەلایـەتی و خوورەوشـت و نـەریتی کۆمـەڵ بێـت، بـەلای دووەمیشـیانەوە دەقی ئەدەبی ڕەنگ پێدەرەوەی هەستو سۆزی نووسـەرە، هەربۆیـە دەبـێ ڕەخنەش تیشك بخاتە سەر دەروونی نووسەرو نـاخی نووسـەرمان بـۆ ڕۆشـن بکاتەوە.

دیـارە ئـەو پێوانـە ڕەخنەییانـەی لـە ڕێبـازی ڕۆمـانتیکی بـۆ شـیعری (لیریکـی– ویـژدانی) دەسـتیان دەدا کـە دیـارترین بەرهـەمی ڕۆمانتیکـەکان بووەو بابەتەکانیان بابەتی کەسی بوون بەپێچەوانەی بەرهەمی کلاسـیکەکان کە تراجیدیا و کۆمێـدیا بـوون و بابەتـەکانیان مـەوزوعی بـوون نـەك خـودیو کەسی، لەدوای ڕێبازی ڕۆمانتیکی کۆمەڵێ ڕێبازی تری ئەدەبی سەریان هەڵدا

وەك ڕێبـازی (ڕیـالیزمی و ڕۆمانسـیو هێمـا گـەری و فۆرمـالیزمی و هتـد.....)
لەپاڵ ئەم ڕێبازە ئەدەبیانەشدا چەند ڕێبازێکی ڕەخنەیی هاتنـە کایـەوە کـە گرنگترینیان ڕێبازی شـێکاری دەروونـی و ڕێبـازی مارکسـی و ڕێبـازی شـێوە گەرایی یان بنیاتگەری بوون.

بەگشتی ڕەخنەی نوێ لە ئەدەبی ئەوروپی سەدەی نۆزدە پـێ لەسـەر ئـەوە دادەگـرێ کـە دەبـێ پێوانـە ڕەخنەییـەکان بابـەتی بـن و لـە بازنـەی تێڕوانینی کەسیی ڕەخنەگردا نەهێلرێتـەوەو ڕاسـتەوخۆ لـە سروشـتی دەقـی ئەدەبی خۆیەوە بەدەست بهێنرێن

## ڕەخنەی ڕۆژهەڵاتیی ( عەرەبی ئیسلامی ):

مەبەسـت لـەو ڕێـڕەوە ڕەخنەییەیـە کـە سـەرەتا لـە ئـەدەبی عەرەبیـدا کراوەتەوەو پاشتر لەلایەن ئەدەبی میللەتـە موسـڵمانەکانی تـرەوە فـراوانترو بەربڵاوترکراوەو بووەتە تیۆرێکی ڕەخنەیی تایبەت بەو گەلانە، سەرەتای ئەم ڕێڕەوە لـە ئـەدەبی عـەرەبی سـەردەمی (جـاهیلی)یـەوە دەسـت پێدەکات، ئەوەش کاتێ کە هۆزە عەرەبەکان ساڵانە لە بازاڕی (عوکاز) لە نزیـك مەککـە کۆ دەبوونەوەو شاعیرانی هەر هۆزێك بەرهەمی خۆی بۆ شـاعیرێکی گـەورەی ئەوکاتــە کــەناوی (نابغــە ئــەل زوبیــانی)بــووە خوێندوەتــەوە ئــەویش وەك دادوەرێکــی ئــەدەبیو ڕەخنــەگرێك ڕاو بۆچــوونی خــۆی دەربــارەی دەقــە شیعرییەکان خستووەتە ڕوو، پێوانە ڕەخنەییەکانیش زیـاتر هونـەری بـوونو لە دەوری وشەو واتای جوانو گونجاوو شیاوو شایستە سووڕاونەتەوە.

پاش بڵاوبوونەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامیش پێوانە ڕەخنەییەکان لـە ڕێنماییەکانی ئایینی ئیسـلامەوە بەدەسـت دەهێنـرانو لـە ڕوانگـەی بـاوەری

ئـاییني شـاعیرەوە لــەدەقی ڕۆنــراوەو داوا دەكـرا كـه شـاعیران دەبــێ (پەیامدار)بن‌و بەرهەمەكانیان لە خزمەتی كۆمەڵگا ئیسلامییەكە دابێت.

قۆناغێكی گرنگی ئەم ڕێڕەوە ڕەخنەییە سەردەمی عەباسییەكان بـووە كە بەهۆی تێكەڵاو بوونی ڕۆشنبیری گەلـە موسـڵمانەكانەوەو بـەهۆی ئاگـادار بـوون لـە ئـەدەبو ڕەخنـەی یۆنـانی بەتایبـەتی (هونـەری شـیعر)ەكـەی (ئەرستۆ)، پێوانە ڕەخنەییەكان فراوانتر بوون و بـەرەو بایەخـدان بـە لایـەنی هونەری براون‌و زیاتر ئەو تێڕوانینە ڕەخنەییە پـەیڕەوی كـراوە كـە بەلایـەوە دەقی شیعری چنراوێكی زمانییـەو دەبێ شـاعیر بایـەخ بەلایـەنی جوانكـاری دەقەكە بداتو لەو بـوارەدا توانـاو دەسـەڵاتی هونـەری خـۆی پیشـان بـدات، لەسەدەی نوزدە بەدواوە ئەو ڕێڕەوە ڕەخنەییە بە سوود وەرگرتن لە ڕێبازە ڕەخنەییەكانی ئەدەبی ئەوروپی گەشەی كردووەو ئاوێتەی ڕێبازە ڕەخنەییـە جیهانییەكان بووە.

## ڕەخنەی ئەدەبی کوردی:

وەك ئاشكرایە ئـەدەبی كـوردی مێژوویـەكی دێرینـی هەیـە و كۆنترین جۆری ئەو ئەدەبەش شیعر بـووە، گومانیشـی تێدا نییـە كـە لەگـەڵ لـەدایك بـوونو بـەرەو پێشچـوونی شـیعری كوردیشـدا ڕەخنـەی ئـەدەبیش سـەری هەڵداوەو گەشـەی كـردووە بـەو پێیـەی هـەر لەگـەڵ پەیوەنـدیكردنی دەقـی ئـەدەبی بـە گـوێگرەوە یـان بـە خوێنـەرەوە، تێڕوانینـی ڕەخنـەییش بـۆ پەسەندكردن یان پەسەندنەكردنی دەق سـەرهەڵدەدات ئەگـەر بەشـێوەیەكی سادەو ساكاریش بێتو پێوانە ڕەخنەییەكانیش زانستی نەبن.

لەگـەڵ ئەوەشـدا چـالاكیو بەرهـەمی ڕەخنـەییمان لەچـاو بەرهـەمی شیعریدا كزولاواز دەبینرێ چونكە تا ئێستاش وتارو لێكۆڵینـەوەی ڕەخنـەیی پـێش سـەدەی بیسـتەممان نەهاتووەتـە بـەر دەسـتو ئـەو بەرهەمـە ڕەخنەییانەی كە هەن مێژووەكەیان دەگەڕێتەوە بۆ سالآنی بیستی سـەدەی ڕابردوو بە دواوە كە ڕۆژنامەگەری كوردی تیایدا بەرەو گەشەسـەندن چـووەو چاپەمەنی كوردیش بەرەو پێش هاتووە.

## شاعیرانی کورد و هەندێ بۆچوونی ڕەخنەیی:

لەگەڵ ئەو دیاردەی كزیو لاوازییەی ڕەخنەی كوردیشـدا، دەكرێ ئـەو ڕاستییە بخەینە بەردەست كە لە قۆناغە جیاجیاكانی شیعری كـوردی پـێش سەدەی بیستەمدا چالاكی ڕەخنەیی لە ئارادا بووەو شـاعیرانی كـورد خۆیـان لـە بەرهەمـە شـیعرییەكانیاندا تێڕوانین و بۆچـوونی ڕەخنـەییان خسـتووەتە بەردەستو دەستنیشانی كۆمەڵێ پێوانەی ڕەخنەییان كردووە.

شاعیرێك لەو شاعیرانەش كە لە بەیتە شیعرییەكانیدا كۆمەڵێ باسی ڕەخنەیی ورووژاندووە، (مەلای جزیری)یە كەلەیەكێ لە دەقە شیعرییەكانیدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| **ئەحسەن ژ ڤی نەزمی لەتیف** | **چەندی سڤك هاتی خەفیف** |
| **مەحبوب بدەستێ خوی شەریف** | **نەقدی مە مووهرو سککەدا** |
| **ئەحسەن ژ ڤی وەسفێ رەفیع** | **ئەشکال و ئەوزاعێن بەدیع** |
| **تێتن ژ نوورێ وەك رەقیع** | **بێ عەیب و نەقس و رەخنەدا** |

**دوو دێری کۆتایی لەبەر بکرێت**

لەو چەند بەیتەدا (مەلای جزیری) وشەی ڕەخنەی بەو واتایە بەکارهێناوە کە ئێستا بەکاری دەهێنن لەپاڵ ئەو وشەیەشدا کۆمەڵێ زاراوەی ڕەخنەیی بەکارهێناوە کە هەریەکەیان تایبەتن بەچەند پێوانەیەکی ڕەخنەی شیعرییەوە، وەك (نەزمی لەتیف)و (سڤك) و (ئەشکال و ئەوزاعین بەدیع)، بەو پێوانانەش ئەو بنەما ڕەخنەییە دەستنیشان دەکات کە بەلایەوە: باشتر شیعر ئەو شیعرەیە کە وشەکانی جوانو چێژ بەخشو ڕەوان بن و واتاکانیشیان سوود بەخش بن.

شاعیرێکی تری کورد کە بەوردی ئاوڕی لەچەند کێشەیەکی ڕەخنەیی داوەتەوە(ئەحمەدی خانی)یە کە لە (مەموزین)ەکەیدا کۆمەڵێ پێوانەی ڕەخنەیی سەردەمەکەیمان بۆ دیاری دەکات، کاتێ دەڵێ:

| | |
|---|---|
| **لی هێڤی دکەم ژ موستەعیدان** | **حەرفان نەگرن ل موستەفیدان** |
| **ئەڤ نامەئەگەر خراپە گەر قنج** | **کێشایە مە دگەل وی دوو سەد رەنج** |
| **نەوبارەیی تیفلی نەورەسیدە** | **هەر چەند نەهن قەوی گوزیدە** |
| **لێ من ژ ڕەزان نەکر تەمەتوع** | **مانەندی دزان بکەن تەتەبوع** |

**دوو دێر لەبەر بکرێت**

لێرەدا (خانی) ئەو ڕاستییە دەخاتە بەردەست کەدەقی شیعری دوای لەدایکبوونی لەلایەن ڕەخنەگرانەوە ڕەخنەی لێدەگیرێ بۆیە ئەمیش داوا لە ڕەخنەگران دەکات کە لەکاتی ڕەخنە گرتندا ڕەنجو ماندووبونی شاعیریان

لەبەرچاو بێتو ئەگەر کەمو کوڕییەکیش لە شیعرەکەدا هەبوو ئەوا نەیکەنە بەهانەو بەیەکجاری دەقەکە بەبێ سوودو بێ کەڵك دابنێن چونکە هەموو دەقێك کە ڕەسەن بێتو دزراو نەبێت وەك ڕۆڵەی شاعیر وایەو لای شاعیر خۆشەویستە و کەسیش پێی خۆش نییە کە بە خراپی لە منداڵەکانی بڕوانرێ، بەو تێڕوانینە (خانی) ئاوڕی لە باسێکی ڕەخنەیی گرنگ داوەتەوە کە کێشەی داهێنان هەر لای (خانی)و لەم دوو بەیتەدا کە دەڵێ:

**ئەی خامە تەژی گەلەك درێژ کر ئەڤ نامە بەسە تە پڕ قرێژ کر**

**هەرچەندە کەلام شوبهی دوڕبەت بێ قەدر دبت دەماکو پڕ بیت**

واتە: ئەی قەڵەمەکەم تۆ درێژەت بە باسەکەداوە، ئیتر بەسەو لە کورتی بیبڕەوە چونکو وتەکان ئەگەر وەك گەوهەریش بن کە زۆربوون بێ نرخ دەبن. وەك دیارە لێرەدا خانی باسێکی گرنگی ڕەخنەیی دەوروژێنێ کە ئەویش باسی (کورت بڕی)یە لە دەقی شیعریدا و بۆخۆی تا ئەمڕۆش پێوانەیەکی ڕەخنەی شیعرییەو هەمیشەش داوا لە شاعیران کراوە کە هەوڵ بدەن بە کەمترین وشە زۆرترین واتا بدەن بەدەستەوە.

لەبەرهەمی شیعری شاعیرانی کرمانجی خوارووشدا دەتوانرێ ئەو ڕاستییە بەدەست بهێنرێ کە چالاکی ڕەخنەیی هاوتەریبی چالاکی شیعر بووەو بەپێی کۆمەڵێ پێوانەی ڕەخنەیی چ شاعیران خۆیان بووبن یان گوێگرەکانیان بوووبن ڕاو بۆچوونی ڕەخنەییان دەربارەی دەقی شیعری دەربڕیوە.

لەچەند بەیتێکی (نالی)دا کۆمەڵێ پێوانەی ڕەخنەیی خراونەتە ڕوو کە لەبنەما گرنگەکانی ڕەخنەی ئەدەبی سەردەمەکە بوون. لەو بەیتەدا کەدەڵێ:

**کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کردییە خۆکوردییە**

**هەرکەسێ نادان نەبێ خۆی تالیبی مەعنا دەکا**

دیاره لێرەدا (نالی) ڕوو لەو کەسانە دەکات کە ڕەخنەیان لێ گرتووەو توانجی ئەوەیان لێ داوە کە شیعر بەزمانی کوردی دەڵێ‌و شیعری کوردیش بەهرەو هونەرمەندیی تیادا نییە، پێیان دەڵێ هونەرمەندیی لەوەدایە کە چۆن توانیویەتی بەزمانی کوردی ئەو واتا جوان‌و ناسکانە دەربڕێ، بەم پێیەش (ناڵی) لێرەدا بەو پێوانە ڕەخنەییە (وشە و واتای) شیعری هەڵسەنگاندووە کە بەلایەوە بەهای دەق واتای جوان‌و نوێیە نەك هەر بەتەنها وشەو واژەی جوان و ڕازاوە.

لەبەیتێکی تردا نالی دەڵێ:

**نالی عەجەب بە قووەتی حیکمەت ئەدا دەکا**

**مەعنایی زۆرو گەورە بە لەفزی کەم‌و بچووك**

کەواتە لێرەدا (نالی)یش وەك ئەحمەدی خانی دەستنیشانی ئەو بنەڕەتە ڕەخنەییە دەکات کە بەلایەوە شیعری جوان‌و بەهادار ئەو شیعرەیە کە بەکەمترین وشە زۆرترین واتای دەربڕیوە.

لەچەند بەیتێکی (سالم)یشدا باس لەو پێوانە ڕەخنەییانە کراوە کە لەسەردەمەکەیدا ڕەخنەگران بایەخیان پێداوە وەك لەم پارچە شیعرییەیدا دەیبینین کەدەڵێ:

**لە ڕۆژی ئیمتیحانا دیم بەرابەر تالیب‌و مەعشووق**

**کەمەر بەستەی هونەر هاتن لە تیپی عیشق بازانا**

**لەیەك لا ناڵی‌و مەشوی لە لایی سالم‌و کوردی**

**لە هەنگامەی هونەرگەرمی تکا جو بوون لە مەولانا**

**لە مەیدانی بەلاغەتدا بەسواری مەرکەبی مەزموون**

**بەکوردی هەریەکە تازی سواری بوون لە بابانا**

**دوو دێر لەبەر بکرێت**

ئـەو چەشـنە شـانازی کردنـەی سـالم بـە توانـای شـیعری خـۆیو شـاعیرانی هاوڕێیەوە، پەردە لەسەر ئەو ڕاستییە هەڵدەداتـەوە کـە بنـەڕەتێکی گرنگـی ڕەخنەیی لەو قۆناغە ئەدەبییەدا توانای بەکارهێنانی هونەرەکانی ڕەوانبێـژی بووە بۆیە دەڵێت( شاعیرانی کورد توانیویانە ڕەوانبێژی عـەرەبی بخەنـە ژێـر ڕکێفی خۆیانو بە زمانی کـوردی لـە مەیدانی ئەوزانسـتەدا ببنـە سوارچـاکی سەردەمەکەیان.

(حاجی قادری کۆیی)یش لە چەند بـەیتێکی شـیعرەکانیدا ئـاوڕی لـە چـالاکی ڕەخنەیی سەردەمەکەی داوەتەوەو کۆمەڵێ بنەڕەتی ڕەخنەییمان بـۆ دیـاری دەکات، وەك لەم بەیتانەیدا دەیبینین:

**شەبیهی جۆڵا کە رازی نەبێ بەسەر دری خـــۆی**
**مەڵێن فەسـاحەتی کـوردی بە فارســی نــاگـا**
**بەلاغەتـێکی هـەیـە هیـچ زوبـانی نایگـاتـێ**
**لە بـێ تەعـەسـوبی کـوردانـە بێ ڕەواج و بەها**
**کە خۆتـی تێنەگەیێنی لە نـیکتەکانی نــەگـەی**
**ئەڵــێی هەمـووی هـەزەیـانە خـوا بـەلای لێدا**
**بەڵام ئەوانەی کە سەررافی زێڕو زیوی قســەن**
**بەشـــاە ڕەوایـــە دەزانـــن سککەیـکـە ڕەوا**

## تەنها دوو دێر بۆ لەبەرکردنە

لێرەدا حاجی قادر زیرەکانە گرنگی ڕەخنەمان بۆ دەستنیشـان دەکـاتو ئەو ڕاستییە دەخاتە بەردەست کە ڕەخنەگر دەبێت کەسانی شارەزاو بەتوانا بن چونکە هەموو کەسێ ناتوانێ ببێتە ڕەخنـەگر، کـە حـاجی بـە (سـەررافی زێڕوزیـوی قسـە) ناویـان دەبـات، لەلایـەکی تریشـەوە بـە پشـت بەسـتن بـە پێوانەیەکی ڕەخنەیی ئەو سەردەمە کە پێوانەی ڕەوانبێژی و ڕوونبێژی بووە

بـەهای شـیعری کـوردی دیـاری دەکـات و شـانی پـێ لێ دەدات لـە شـیعری فارسی ئەو چالاکیو پێوانە ڕەخنەییانە کە لە ئەدەبی کوردی پێش سـەدەی بیستەمدا تەنها لە شـیعردا ڕەنگیـان پێدراوەتـەوە و لـە وتـارو لێکۆڵینـەوەدا نەخراونەتە بەردەست.

## ڕەخنەی ئەدەبی کوردی لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی*

لـەدوای جـەنگی جیهـانی یەکـەمو لەگـەڵ سـەرهەڵدانو بـەرەوپێش چـوونی چاپەمەنی کوردیدا ئەوانیش گەشەیان کردو بەرەو پێش چـوونو بـەرفراوانتر بوون.

لێرەدا ئاوڕ لە هەندێ لەو بەرهەمە ئەدەبییانـە دەدەینـەوە کـە لابـەلا تێڕوانینی ڕەخنەییان خستووەتە بەردەست یـان ڕاسـتەوخۆ بۆخۆیـان وتـارو لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی بوون.

بەرهەمێك لەو بەرهەمانە کتێبێکی (ئەمین فەیزی بەگ)ە کـە لـە سـاڵی (١٩٢٠)دا بە ناونیشانی (ئەنجومەنی ئەدیبان) لە ئەستەمبوول چاپکراوە. لەو کتێبەدا بەکورتی بـاس لـە ژیـانی چـەند شـاعیرێکی کـورد کـراوە نموونـە لـە شـیعرەکانیان خراوەتـە بەردەسـت، بـەم پێیـە ئـەو کتێبـە دەچێتە خانـەی مێـژووی ئەدەبـەوە نـەك ڕەخنـەوە، لەگـەڵ ئەوەشـدا هەنـدێ ڕاو بۆچـوونی ڕەخنەیی دەربارەی ئەو شاعیرانە خستووەتە ڕوو، وەك ئەم تێڕوانینـەی کـە دەربارەی (نالی)یەو دەڵێ: ((زەکای ئینکـار نـاکرێ لاکـن ئەوەنـدە سـەنایعی لەفزییەی ئیستیعمال کردووە پیاو ڕەنگە بڵـێ شـیعری ئـەو نەتیجـەی علـم و ئیشتیغالە)).

دیارە لێرەدا مەبەست لەوەیـە کـە (نـالی) لـە داهێنـانی شـیعریدا زیـاتر بایـەخی بـە لایـەنی جوانکـاری داوەو هونەرمەندانـە مامەڵـەی لەگـەڵ دەقـی

* تێبینی : هیچ دەقێکی ڕەخنە بۆ لەبەر کردن نییە.

شـيعريدا كـردووەو داهێنانـەكانی ئاكـامی زانسـتو زانیـاری شـيعرييە زيـاتر لەوەی كە هەڵقوڵاوی بەهرەی شیعری بێت.

لەباسی (مەولەوی)یشدا ڕای وایەكە مەولـەوی لـە ڕێكخسـتنی سـەروادا داهێنانی كردووە كاتێ لە چوارينێكدا سەروای دێرِی یەكـەم و سـێیەمی هـاو سەروا كردووەو دێڕی دووەم و چوارەمیشـی بـە سـەروايەكی تـر هـاو سـەروا كردووە، ئەم چەشنە بەكارهێنانەی سەرواشی لە شـيعری هـيچ میللەتێكـەوە وەرنەگرتووە بەڵكو خۆی دای هێناوە.

هەر لە ساڵانی بیستی سەدەی ڕابردوودا (شـيخ نـوری شـێخ سـاڵح)یـش ساڵی (١٩٢٦)لە ڕۆژنامەی (ژیانەوە)دا بە زنجـیرە لێكۆڵینـەوەكی دەربـارەی ئـەدەب بەگشـتیو شـيعر بەتايبـەتی بڵاوكردووەتـەوە، لەگـەڵ ئـەوەی ئـەو لێكۆڵینەوەیە زیاتر دەچێتە خانەی تیۆری ئەدەبەوە بەڵام لەو باسـانەیدا كـە دەربـارەی (جـوانی) دەقـی ئەدەبییـە لـە تیـۆری ڕەخنـەی ئـەدەبی نزیـك دەبێتـەوە بـە تايبـەتی لـەو باسـەيدا كـە جيـاوازی نێـوان زمـانو شـيوازی ئاخاوتنی ڕۆژانەو شێوازی زانستیو شێوازی ئەدەبی دیاری دەكات.

بەرهەمێكی تری بڵاوكراوەی نووسەرانی كورد لـە بـواری ئـەدەب و ڕەخنـەی ئەدەبیدا، ئەو وتارەیە كە نووسەرێك بە ناوی (سیاپۆش) سـاڵی (١٩٣٢) بـە ناونیشـانی (شـاعرەكانمان) بـڵاوی كردووەتـەوە، ئـەم وتـارەش نـەك هـەر ڕاستـەوخۆ دەچێتە خانـەی ڕەخنـەوە بـەڵكو دەرگايـەكی نـوێش لەبـەردەم ئەدەبو ڕەخنەی ئەدەبی كورديدا دەكاتەوە، وشـيارانە دەيـەوێ سـيمايەكی تازە بە ئەدەبی كوردی بپۆشێ و بەرگێكی نوێ بكاتە بەر ڕەخنـەی ئـەدەبی كـوردی، بۆيـە دەڵـێ((   شـاعیرەكانمان هـەتا ئێسـتا بڕواناكـەم لـە واتـەی سوپاسو ستايشی زياتريان بيستبێ، یەكێك بە (( توتی شەكر گوفتار) ئەوی

تر به (بلبلی شیرین کەلام) ناوی لێ ناون، هەرچەندە ئەو ناونیشانەشیان لە لاپەڕەی هیچ پارچە کاغەزو گۆشەی هیچ ڕۆژنامەیەکدا بۆ نەنووسراوە بەڵام لە مێشکی خۆیانو هەندێ دەوروپشت و ناسیاویاندا زۆر چاك جێگیر بووە. بەڵێ هەتا ئێستا بێ لێکدانەوە هەڵمان کێشاون... بەڵام لەمەودوا ئەو دەورە ڕۆیشت کە بە زەرد بگوترێ زێڕو بەسەدەف بگوترێ مرواری، لەمەو دوا ڕۆشنایی زانین بەرچاومان ڕووناك دەکاتەوە هەموو شتێ وەکو خۆی دەبینین و پێویستە هەرشتە بە پێی بەرزیو نزمی خۆی ڕیزبکەین و بەپێی چاکیو خراپی ناوی لێ بنێین بەبێ بۆن نەڵێین نێرگزو بە نێرگز نەڵێین بێ بۆن))

هەر لەو وتارەدا (سیاپۆش) هەوڵ دەدات چەمکێکی نوێ بۆ شیعری کوردی بخاتە بەردەستو بەپێی ئەو چەمکە شیعری شاعیران هەڵسەنگێنرێ، بۆیە دەڵێ(( شیعر تەرجومانی دڵە چی بە دڵا بێت ئێشو ئازارو دەردو خەفەت و هیواو نائومێدی، باوەڕو ترس و بێ باکیو خراپی و چاکیمان بە کەلیماتی ڕێكو پێك لە شێوەیەکی دڵگیرا بۆ دەردەخات کە هەرکەس لە ئانی خوێندنەوەیدا شێوەیەکی دڵی خۆی تیا دەبینێت، شیعر چرایەکە تاریکی ژیانمان بۆ ڕۆشن و یارمەتیمان ئەدات لە دۆزینەوەی حەقیقەتا)) جا لەگەڵ ئەوەی بەپێی ئەم چەمکەی شیعر بەگشتی شیعری کلاسیکی ڕەت دەکاتەوە بەڵام خودی وتارەکە بۆخۆیو لەو سەردەمەدا بە تێڕوانینێکی ڕەخنەیی گەلێ نوێ دادەنرێت و شوێنێکی دیار لە ڕێڕەوی ڕەخنەی کوردیدا دەگرێت.

لە دوای ئەم وتارەی (سیاپوش) وتارو لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەیی ئەوتۆ لەسییەکانی سەدەی ڕابردوودا بڵاونەکراوەتەوە کە بەڕادەی ئەو گرنگ بن و ڕاستەوخۆ بچنە خانەی ڕەخنەی ئەدەبییەوە، ئەوەی کەلەو ساڵانەدا دێتە بەردەست کتێبێکی (عەلی کەمال باپیر)ە کە ساڵی ١٩٣٩ بە ناوونیشانی

(گوڵ دەستەی شوعەرای هاو عەصرم) بڵاوی کردووەتەوە، ئەم بەرهەمەش دەچێتە خانەیمێژووی ئەدەبەوە نەك ڕەخنەی ئەدەبییەوە چونکە بەکورتی باس لە ژیانی چەند شاعیرێکی کوردی هاوچەرخ دەکاتو نموونەی شیعرەکانیان دەخاتە بەردەست، بەڵام لەگەڵ بڵاوبوونەوەی گۆڤاری (گەلاوێژ)دا زەمینەیەکی لەبار ڕەخسا بۆ وتاری ڕەخنەیی و کۆمەڵێ نووسەر لە بواری پراکتیکیدا کۆمەڵێ وتاری ڕەخنەییان بڵاوکردووەتەوە، بێگومان ئەو وتارانەش لەئاستی جیاجیادا بوون و زۆر جار بۆخۆیان بوونەتەوە جێگای ڕەخنە لێ گرتن، هەروەك لەو وتارەی (جەمیل بەندی ڕۆژ بەیانی)دا دەردەکەویت کە تیایدا ڕوو لە گۆڤاری گەلاوێژ دەکاتو دەڵێ (( تکا دەکەم- لێت دەپاڕێمەوە- خۆت ئەم ئەرکی ڕەخنە بازییە بگرە مل وە مەیدە بەکەس وردبینانە وشەو وتەکان والابێژ کە مەیدان بەوە مەدە کە هەندێ کەس لە تویێ پەردەوە ئامانجی بێفەر بڵاو بکاتەوە یا وشەی بێ جێ بەکاربێنێ)).

لە ساڵی (١٩٤١ز) بەرگی یەکەمی (شیعرو ئەدەبیاتی کوردی) ڕەفیق حلمی کەوتە بەردەستی خوێنەران، ئەگەر چی ئەم بەرگەی زیاتر دەچێتە خانەی مێژووی ئەدەبەوە بەڵام لە هەندێ شویندا ڕاو بۆچوونی ڕەخنەیی دەربارەی شاعیرەکان خستووەتە بەردەست.

لە پەنجاکانیشداو لەگەڵ بەرفراوان بوونی ئاسۆی بەردەمی ئەدەبی کوردی، ڕەخنەی ئەدەبیش بواری چاکتری لەبەر دەمدا کردنەوە، لەساڵی (١٩٥٢)دا بە بڵاو بوونەوەی (مێژووی ئەدەبی کوردی) عەلائەددین سوجادی خوێنەری کورد زیاتر ئاشنای شیعرو شاعیرانی نەتەوەکەمان بوون و بواری هەڵسەنگاندن و تێڕوانینی ڕەخنەیی زیاتر لەبەر دەمدا کردنەوە.

لەساڵی (١٩٥٦)یشدا بەرگی دووەمی (شیعر ئـەدەبیاتی کـوردی)رەفیـق حلمی، لەپاڵ باسی ژیان و شیعری دەستەیەك لە شاعیری کوردا، کۆمەڵێ ڕاو بۆچونی ڕەخنەیی وردی دەربارەیـان خسـتووەتە ڕوو، وەك ئـەم تێڕوانینـەی کــە دەربــارەی (گــوران)ی شــاعیرەوە دەڵــێ:(( گــۆران شــاعیرێکی (فەننان)و(واقعی)یە بێ ئەوەی لە رەغنـەیی یاخود لـە واتەکـەی خۆمـان بـە گومان بین، ئەڵێین (گۆران) بە ڕاستی بوێژێکی واقعیو فەننانە، بوێژێکـە کـە مادەی شیعرەکانی لە کانگای ژیان واتە ژیانی کۆمەڵایـەتی کـورد هـەڵێنجاوە وە کردوویە بە (بوودەقە)ی ئەدەبا ئینجا لـەم وێنـە سـیحراوی و دڵ فریبـەدا کـە پێـی ئـەڵێن (شـیعر) بـۆی هێناوەتـە دەرێ) لەسـەرەتای سـاڵی (١٩٥٨) یشداو بە دەرکردنی گۆڤاری (شەفەق)لە کەرکووك و بەو وتارە ڕەخنەییانـەی کــە تیایــدا بڵاوکراوەتــەوە، ڕەخنــەی ئــەدەبیی گەشەســەندنێکی دیــاری بەخۆیـەوە بینـی، چـونکە وتـارە ڕەخنەییـەکان ورد تـرو زانسـتانەتر بـوون‌و جێگـای بایەخپێـدانی ئـەدەب دۆسـتان بـوون هـەر بۆیـەش دەبیـنین کـە نووسەرانمان لەسەر لاپـەڕەی ئـەو گۆڤـارە کەوتوونەتـە ئـاڵو گـۆڕکردنی ڕاو بۆچوونی ڕەخنەیان دەربـارەی هەنـدێ باسـی ئـەدەبیو دەربـارەی شیعری شاعیرانی ئەو سەردەمە، وەك وتاری (کامەرانو دیارییەکە)ی مارف بەرزنجی و (کـوردو شـیعر)ی هەسـان و (کـوردو ئسـلوبی شـیعر)ی مـارف خەزنـەدارو (شیعرو نووسینی کـوردی) رەفیـق حلمـی و وتـارێکی تـری ڕەخنـەیی مـارف بەرزنجی بەناوونیشانی (کۆن‌و تازە لە شیعردا) کـە تیایـدا دەڵـێ (( شـاعیرو بوێژانی ئەم سەدەی بیستەمە کۆتو زنجیری کۆنیان شکاندو قاڵبێکی تریـان دروستکرد. وازیان لە قافیـە هێنـا، وەزنیـان بـە چەشـنێکی کـە هەڵسوڕاند، جــاران وەزن لەســەر کەرتــە شــیعر دائەمــەزرا، ئیمــڕۆ لەســەر (تەفعیلــە)

دائەمەزرێ، گوێ نادرێتە کورتی و درێژی کەرتەکانی شیعر بەڵام مۆسیقا ئەپارێزێ ئەویش بە لانەدان لە وەزن)).

هەر لەساڵی (١٩٥٨)داو دوای شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ بواری ئەوە لەبەردەم نووسەرانی کوردی کرایەوە کە لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی بڵاوبکەنەوە، وەك لێکۆڵینەوەکەی (حسێن عارف) کە بەناوی (محەمەد سدیق عارف) و بەناوونیشانی (کامەران‌و هۆنراوەی نوێ)وە بڵاوکرایەوەو لێکۆڵینەوەیەکی (محەمەدی مەلاکەریم) دەربارەی (حاجی قادری کۆیی)و لێکۆڵینەوەیەکی (کامیل حەسەن بصیر) بەزمانی عەرەبی‌و بە ناوونیشانی (کامران شاعر من کوردستان).

هەر لەبواری گەشەسەندنی ڕەخنەی کوردیدا نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێت کە بەکردنەوەی بەشی کوردی لە ساڵی(١٩٥٩-١٩٦٠ز) لە کۆلیژی ئادابی زانکۆی بەغداو بوونی بابەتی ڕەخنە بە پرۆگرامی خوێندنی ئەو بەشەداو وتنەوەی ئەو بابەتە بۆ ماوەیەك لەلایەن (گۆران)ی شاعیرەوە، ڕەخنە سیماو شەقڵێکی گەشترو زانستانەتری وەرگرت.

لە ناوەڕاستی شەستەکانیشدا بە ئامادەکردنی کۆمەڵێ نامەی ئەکادیمی لەلایەن ئەو خوێندکارانەی کە لەدەرەوەی عێراق بڕوانامەی دکتۆرایان لە ئەدەبی کوردیدا بە دەست هێنا بوو ڕەخنەی ئەدەبی هەنگاوێکی نوێی بەرەوپێش چوونی بۆ ڕەخسا، وەك (ڕیالیزم لە ئەدەبی کوردیدا) (د.عیزەدین مستەفا رەسول)و( کورتەی مێژووی هاوچەرخی ئەدەبیاتی کوردی) (د. مارف خەزنەدار) و (حاجی قادری کۆیی- ژیان‌و بەرهەمی) (د.ئیحسان فوئاد).

لـە سـاڵی (١٩٧٠)شـداو لەگـەڵ سـەرهەڵدانی بزووتنـەوەی (ڕوانگـە)دا ئاسۆیەکی نوێ لەبـەردەم چالاکیو جموجۆڵی ڕەخنەییدا کرایـەوەو لـەپاڵ بەرهـەمی بڵاوکـراوەی نووسـەرانی سـەربەو بزووتنەوەیـەدا کۆمـەڵێ وتـاری ڕەخنەییش دەربارەی بزووتنەوەکە خۆیو دەربارەی بەرهەمە ئەدەبییـەکان بڵاوکرانەوە، بەم پێیـە خـودی بزووتنـەوەی ڕوانگـە بـوارێکی نـوێو فراوانـی لەبـەردەم ڕەخنەشـدا کـردەوە، هـەر بۆیـە (شـێرکۆ بێکـەس) لـەو کاتـەدا وتوویەتی:(( هەموو بەرهـەمێکی ئـەدەبی پێویسـتە دوو پێوانـەی بـۆ بکرێـت پێوانەیـەکی سیاسـیو پێوانەیـەکی هونـەری ئـەم دوو پێوانەیـە دوولای یـەك مەسـەلە پێکدەهێنن کـە ئـەویش ڕەخنـە گرتنـی ئەدەبییـە بۆیـە بەیەکـەوە گرێدراون و یەك کار ئەکاتە سەر ئەوی تر)).

لـەدوای سـاڵی (١٩٧٥)یـش ئەگەرچـی تـا ڕادەیـەك ئـەدەبو ڕەخنـەی کوردیش وەك شۆڕشەکەی تووشی جۆرە نوشستییەك بوو بـەڵام خـۆڕاگری و چۆك دانەدانی ئەدیبانو نووسەرانی کـورد نـەك هـەر بـووە هـۆی ئـەوەی کـە بەرهەمی ئەدەبیمان بەردەوام بێت و بە زیندوویی بمێنێتەوە بـەڵکو خولیـای داهێنـانو هـەنگاو نـان بـەرەو پـێش چـوون بووبـوو سـیمای دیـاری سـاڵانی هەشتای ئەدەبی کوردیمان، دیارە ڕەخنەش لەو خولیایە بـێ بـەش نـەبووەو کـەم تـا زۆر نووسـەرانمان لـە پێنـاو گەشـەدان بـە ئەدەبەکـەمان تێڕوانینـی ڕەخنەیی خۆیان بڵاو کردووەتەوە، وەك ئەو بـۆ چـوونەی کـە نووسـەرەکەی دەربـارەی ئـەدەبی ئـەو سـاڵانە دەڵـێ : (( هونـەرو ئـەدەبیش چـەکێکی کاریگەرن لە چەکەکانی خەباتی میللەت بـۆ ئـازادیو بەختـەوەری و بـە هـیچ چەشنێك لە جۆرەکانی دیکەی خەباتی سیاسی جیا ناکرێتەوە بەتایبـەتی لـە قۆناغێکدا وەك قۆناغی ئەمڕۆی بزووتنەوەی نیشتیمانیمان)).

# پەخشـــــان

**پەخشان بەشێکە لەئەدەب** برتییە لەو دەربڕینو نووسراوانەی کە هەستو سۆزی مرۆڤ نیشان دەدات پەخشانی نوێ بە گشتی بایەخ بە کێشو سەروا نادات.

## جۆرەکانی پەخشان:

بەشێوەیەکی گشتی پەخشان دەکرێت بەم جۆرانەوە:

**١- پەخشانی زانستی:** ئەو پەخشانەیە کە باس لە بابەتێکی زانستی دەکات و بایەخ بە هەستوسۆز نادات، وەك بابەتەکانی (کیمیا، فیزیا، پزیشکی، بیرکاری....).

**٢- پەخشانی ئەدەبی:** ئەو پەخشانەیە کە زیاتر بایەخ بە هەستوسۆز دەدات بۆ ئەوەی کارلە بەرامبەرەکەی بکاتو چێژی پێ ببەخشێ، وەکو (وتاری ئەدەبی، چیرۆك، یاداشت، نامە، ژیاننامە، وەرگێرانی ئەدەبی، وتووێژە ئەدەبییەکان....).

# وتـــــار

**پێناسەی وتار:** هونەرێکی ئەدەبییە نووسەر بە شێوەیەکی کورتو وردو سەرنج ڕاکێش لایەنێکی ژیان باس دەکات و بیروڕای خۆی دەربارەی دەخاتە ڕوو.

## خاسیەتەکانی وتار:

١- کورتی، کە دەبێت وتار لە چەند پەڕەیەك تێپەڕ نەکات.

٢- جوانکاری لە دەربڕیندا.

٣- تەکنیك لە نووسیندا، کە هەر نووسەرێك ڕێگایەکی تایبەتی خۆی هەیە بۆ ڕوونکردنەوە و داڕشتنی بابەتەکەی بە زمانی ڕووناکبیری سەردەم.

٤- بابەتی وتار ڕەنگدانەوەی بیرو هەست و سۆزی خودی خاوەنەکەیەتی.

## جۆرەکانی وتار:

وتار وەك بەشەكانی تری ئەدەب بابەتی هەمە چەشنە لەخۆ دەگرێت، لەوانە (وتاری سیاسی، وتاری ئایینی، وتاری ڕەخنەیی، وتاری مێژوویی، وتاری كۆمەڵایەتی.........).

لە قۆناغەكانی پێشووی خوێندندا باس لە سەرەتاو سەرهەڵدانی وتاری كوردی كراوە، لێرەدا لە ڕێڕەوی گەشەسەندنی وتاردا باس لەچەند قۆناغێك دەكەین:

### ١- قۆناغی یەكەم- ساڵانی (١٩٣٩- ١٩٥٨)ز:

بەڵگە نەویستە كە هەموو دەم گەشەسەندنو لاوازبوونی بەرهەمی ئەدەبی كوردیمان، پەیوەند بووە بەو بارودۆخە سیاسیو كۆمەڵایەتیو ئابوورییەی ئەو دەمەی بەرهەمەكەی تێدا هاتووەتە ئاراوە.

لە عێراق لە كۆتایی سییەكاندا لە ساڵی (١٩٣٩)دا گۆڤاری (گەلاوێژ)دەرچوو، كەبەدرێژایی (١٠)ساڵ تا (١٩٤٩) بەردەوامبوو. لەماوەی دەرچوونی ئەم گۆڤارەدا هەموو بەشەكانی ئەدەب بە تایبەتی وتار، گەشەسەندنێكی باشی بە خۆوە دیوە لە ڕوخسارو ناوەرۆكدا.

هەر لە ساڵانی دەرچوونی ئەم گۆڤارەدا تەوژمێكی تری وتار دەبینین بەهۆی دامەزراندنی كۆماری كوردستان لە مەهاباد (١٩٤٦) كە لەو ماوە كورتەی تەمەنی ئەو كۆمارەدا ئەدەب بە گشتی هەنگاوی بەرەو پێش ناوە چەندان گۆڤارو ڕۆژنامەی هەمە چەشنە دەرچوون لەوانە (ڕۆژنامەی كوردستان ١٩٤٦، هەڵاڵە ١٩٤٦، گڕوگاڵی منداڵانی كورد ١٩٤٦،.......).

پاشان لە ساڵانی چلو پەنجاكاندا لە عێراقدا پێش ڕوودانی شۆڕشی (تەمموزی ١٩٥٨) چەندین ڕۆژنامەو گۆڤاری تر هاتنە ئاراوە كە بەهۆیانەوە وتار هەنگاوی بەرچاوی ناوە، لەوانە (رووناهی ١٩٤١، نزار ١٩٤٨، هیوا

١٩٥٧،......) له وتار نووسه دیارەکانی ئەم قۆناغە (برایم ئەحمەد، حوزنی موکریانی، عەبدولڕەحمانی زەبیحی، جەلادەت بەدرخان، عەلائەدین سوجادی، روقیەی قادری، سوڵتان خانمی فەتاحی قازی،.......).

## گرنگترین خاسییەتەکانی وتار لەم قۆناغەدا :

١– زمانی وتارەکان گەشەیان بەخۆیانەوە بینی چونکە زیاتر بەرەو کوردی پەتی دەبران(هەرچەندە هەندیك جار دەقاو دەق وشەی عەرەبی لە نووسیندا بەکارهێنراوە).

٢– نیشانەکانی خاڵبەندی زیاتر بایەخی پێدراوە.

٣– بەهۆی سەرهەڵدانی وتار نووسی ژنەوە کە هاندانی ئافرەتی کورد بۆ خوێندن و خوێندەواری بابەتی سەرەکی ناوەڕۆکی وتارەکانیان بووە.

٤– زۆر وتاری وەرگێڕدراو لەزمانەکانی دیکەوە دەکرانە کوردی ناوەڕۆکی وتاری کوردییان پێ دەوڵەمەندتر دەکرا.

ئەم پارچەیەی خوارەوە نموونەی وتارێکی ئەدەبییە کە لە گۆڤاری (دەنگی گێتی تازە)دا بە خامەی (محەمەد ئەحمەد تەها – کامەران موکری) لە ساڵی (١٩٤٦) دا بڵاو کراوەتەوە بە ناوونیشانی (شەونمی بەری بەیان).

## شەونمی بەری بەیان

**(( بەری بەیان بوو، هێشتا جیهان پەردەی دەستی لانەدابوو، ڕووم کردە باخێك، ئەم هەموو گوڵو گوڵزارانە ئامادەبوون بۆ هاتنی بلبل دەست لە ملیان کات. دڵۆپی شەونم بریسکەی ئەهات، بە چەشنی فنجانی زیوی سەر ژێر پیاڵەی ئاڵتون، کاتێکم زانی بلبل بە ناڵینەوە دەرکەوت، کەچاوی کەوت بە گوڵ گەشاوە، ئەوەو قەترەی شەونمی زێڕینی لەسەر لێویەتی، تۆزێ دڵی هاتەوە جێی خۆیو دەستی کرد بە خوێندنو خەریك بوو دەم بەرێ دڵۆپێ لەو ئاورنگەی سەرلێوی گوڵ بخواتەوە، خەوی لێکەوت...)).**

( تەنها بۆ خوێندنەوەیە )

## ٢- قۆناغی دووەم- ساڵانی ( ١٩٥٨- ١٩٧٠ )ز:

لـــەم ســـاڵانەدا زۆر گۆڕانکـــاری سیاســـی و کۆمەڵایـــەتی و ئـــابووری و رووناکبیری روویانـدا، کـە کاریگەرییـەکی قووڵیـان لەسـەر ئـەدەبی کـوردی دروستکرد.

لـەدووای شۆڕشـی(١٤ ی تـەمموزی ١٩٥٨) چـونکە رژێمێکـی نـوێ دامـەزرا، یاساکانی رژێمی پێشوو گۆڕان، لەوانە بواری ڕادەربڕین و چاپەمەنی فـراوانتر و ئازادتر بوو، ئەمانە بوونە هۆی بەرەو پێش چوونی وتار لـەم قۆناغـەدا، بـە تایبـــەتی بـــەهۆی ئـــەو گۆڤـــار و رۆژنامانـــەی کـــەبلاو دەکرانـــەوە لەوانـــە (شەفەق١٩٥٨، ڕای گەل١٩٥٩، بڵێسە١٩٥٩، رۆژی نوێ١٩٦٠......).

بەلاَم لە سەرەتای سالآنی شەستدا بەهۆی هەڵگیرسانی شۆڕشـی ئـەیلوول و تێکچوونی بارودۆخی سیاسی کوردستان بابەتی وتار بـەرەو لاوازی وسستی رۆیشتووە.

لـە ناوەڕاسـتی شەسـتەکان و دوواتـر بـەهۆی دەرچـوونی چـەند رۆژنامـەو گۆڤارێـك بـوار بـۆ گەشەسـەندنی وتـار ژیایـەوە، لەوانـە رۆژنامـەی (برایـی، برایەتی١٩٦٧، گۆڤاری سلێمانی ١٩٦٨) .

لە نووسەرە ناودارەکانی وتـار لـەم قۆناغـەدا (دکتـۆر عیـزەدین مسـتەفـــا، شێخ محمدی خاڵ، مارف بەرزنجی، مارف خەزنەدار، گۆران، رەمـزی قـەزاز، ئەبو زەید مستەفا سندی....)

## گرنگترین خاسیەتەکانی وتار لەم قۆناغەدا :

١–زمانی وتـار پوخـت تـر بـوو لـەڕووی وشـەو زاراوە دەوڵەمەنـد تـر بـوون، بەتایبەتی کە زمانی نووسینی وتـار بـە دیـالێکتی کرمـانجی خـوارووبـوو موتوربە کراوە بە وشەو زاراوەی دیالێکتەکانی دیکە.

٢- هەوڵ دراوە ڕێنووسێکی ڕاست و درووست پەیڕەو بکرێت شێوازی هونەرییەکەشی بەرز و پڕ لە جوانکاری بێت.

٣- لەڕووی ناوەڕۆکەوە بابەتی سیاسی بۆخۆی سەرەکیترین بابەتی وتار بووە، کە باسی بیری ئازادیخوازی و پێشکەوتن خوازی کراوە. زیاتریش جەخت لەسەر بیروباوەڕی نەتەوەیی و مافەکانی کورد و یەکگرتنەوەی کوردستان کراوە.

٤- لەپاڵ گەشەسەندنی وتاری سیاسی، وتاری کۆمەلآیەتی و مێژوویی ئاسۆی فراوانتریان لەبەردەم کرایەوە بە تایبەتی باسی ئەو بابەتانە کراوە کە پەیوەندیان بە نەتەوەی کوردەوە هەبووە.

٥- لەم قۆناغەش زۆر وتار لە زمانەکانی بێگانەوە وەرگێڕدراون بۆ سەر زمانی کوردی لەهەموو بوارەکانی ئەدەبی و ڕووناکبیری.

نموونەی وتارێکی ئەم قۆناغە کە بە خامەی (ڕەمزی قەزاز) نووسراوە لە ساڵی (١٩٦٧)و لە ژمارە (٢٩)ی (برایی)دا بڵاوی کردووەتەوە و نووسیوویەتی:

**(( ... ئەم گرانییە ئێستا بلاوبووەتەوە بە وڵاتا، گرانییەکی ڕاستەقینە و تەواو نییە، بەڵکو گرانییەکی دروستکراوە لەلایەن چەند جامبازێکی دڵ ڕەقی بێ بە زەییەوە، ئەمانە وەك زەروو وانە، هەمیشە خەریکی مژینی خوێنی چینی هەژار و کرێکارن، ئەمانە لەسەر لاشەی چینی هەژارو کرێکار بناغەی سامان و کۆشك و تەلاریان دادەنێن و ئەیبەن بە ئاسمانا، هەموو بیرو باوەڕ و ئاما نجیان لە ژیانا پارە کۆکردنەوەو دەستکەوتی خۆیانە ... )).**

تەنها بۆ خوێندنەوەیە

## ٣- قۆناغی سێیەم - ساڵانی (١٩٧٠- ١٩٩١)ز:

لــــە دوای دەرچـــوونی بـــەیانی (١١ی ئـــازاری ١٩٧٠)و تاڕادەیـــەك سـەربەخۆیی کوردسـتان بـۆ چـەند سـاڵانێکی کـەم هـەنگاوێکی تـری بـەم بزووتنەوەی ئەدەبی داوەو گەلێك یانەو کۆمەڵە دەرکەوتن کە هەر یـەکێکیان بۆ گەیاندنی بیری خۆیان چەند گۆڤـارو ڕۆژنامـەیان دەرکـرد کـە ئەمـە خـۆی لەخۆیدا هەنگاوێکی تر وتاری بەرەو پێش برد. هەروەك ئەم بارودۆخـە بـووە هـۆی ئـەوەی بزووتنەوەیـەکی ڕۆشـنبیری و هۆشـیاری لـەناو نووسـەران و جـەماوەردا خۆڵقانـد و گـەلێك ڕۆژنامـە و گۆڤـاری ئـەدەبی و زانسـتی و ڕووناکبیری هاتنە مەیدانەوە لەوانە (زانیاری ١٩٧٠)، نووسەری کـورد ١٩٧١، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ١٩٧٣، گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ١٩٧١....).

بێگومان ئەم ڕووە گەشەی بەرەو پێش چوونی وتار تـا سـاڵی (١٩٧٤)ی خایاند بەڵام ڕۆژانی هەڵگیرسـاندنەوەی شـۆڕش لەسـاڵی (١٩٧٤)داو نسـکۆی شـۆڕش لەسـاڵی (١٩٧٥) داو چـەند سـاڵێکی دوای ئـەو ڕووداوە بـۆ خۆیـان چەشنە ئاستەنگێکیان لەبەردەم ئەدەبی کـوردی بەگشـتیو هونـەری وتـاردا دروستکرد، بەتایبەتی کاتێ ڕاگەیاندنی کوردی لـەو چـەند سـاڵەدا ئـەو ڕووە گەشەی پێشووی نەماو کەوتە ژێر فشارەوە.

لەگـەڵ هـەموو ئەمانەشـدا نووسـەرانی کـورد لـە شـارەکاندا، لەوچـەند ژمارە کەمەی ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەی کە لـەو سـەردەمەدا دەردەچـوون وەك (هاوکاری، بەیان، ڕۆشنبیری نوێ)توانییان وتار بەرەو پێش بەرن هەر لـەپاڵ ئەمەدا نووسەرانی شاخیش لە بڵاوکراوەکانی ناو شۆڕشدا چالاکانە بایـەخیان بە وتار داوە بەتایبەتی وتاری سیاسی لە بڵاوکراوەکانی شاخ وەك (نووسەری کوردستان ١٩٨١، گزنگ ١٩٨٣، هەڵمەت ١٩٨٥، قەنـدیل ١٩٨٧، هەڵوێسـتی

ئەدەب ١٩٨٨، بانگ ١٩٨٩،.....)لە دەنگە دیارەکان و قەڵەم ڕەوانەکانی وتار لەم ساڵانەدا (تەها بەرواری، مستەفا نەریمان، عەبدولرەحمان مزوری، جەمال خەزنەدار، عەلی سەیدۆ گەورانی سەلاح شوان،....).

هەروەها ساڵانی هەشتای سەدەی ڕابردوو نووسەرانی کورد لە ڕێگای بەرهەمە ئەدەبییەکانەوە بەرگرییان لە دژی سیاسەتی توانەوەی نەتەوەکەیان دەکرد، هەر بۆیە وتارەکانی ئەو ساڵانە بۆخۆیان دەبوونە بنەماو پێك هێنەرێکی پتەوی ئەدەبی کوردی.

## گرنگترین خاسیەتەکانی وتار لەم قۆناغەدا :

١- لە سەرەتای ساڵانی حەفتاکان زمانی وتار گەشەیەکی زۆر دیاری بەخۆیەوە دی کە لە قۆناغەکانی پێشووتر بەو رادەیە نەبینرابوو.
به تایبەتی کە بەرنامەی خوێندن لە قۆناغەکانی ناوەندی و ئامادەیی بوون بە کوردی، ئەمەش وای کرد کە کۆمەڵێك وشەو زاراوەی نوێ بێتە ناو فەرهەنگی زمانی کوردییەوە و دەوڵەمەندتری بکات.

٢- لە دووای نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول لە ساڵی(١٩٧٥) دیاردەیەك کە بە ئاشکرا هەستی پێ دەکرێت بە تایبەتی لە بڵاوکراوەکانی ناو شاردا بریتی بوو لە دەربڕینی ناڕاستەوخۆ واتە پەنابردنە بەر بەکارهێنانی هێماو نیشانە، ئەمە لە کاتێکدا لەسەرەتای حەفتاکاندا نووسەران بێ ترس و سل کردنەوە هەست و سۆزو بیری خۆیان دەردەبڕی چونکە بارودۆخەکە ئازادی و سەربەستی بۆ نووسەران درووست کردبوو.

٣- لەم قۆناغەدا وتار وەك هۆیەك بۆ پاراستنی زمانی كوردی بەكار دەهێنرا چونكە رژێمی دوژمـن بەنەتـەوەی كـورد، هـەوڵی شـێواندن و لـەناوبردنی زمانی كوردی دەدا.

٤- لە دووای نسكۆی (١٩٧٥) جیاوازی كەوتە نێوان نووسـەرانی شـارو شـاخ لـە خسـتنە رووی بابەتەكانـدا چـونكە ئـەو سەربەسـتییەی نووسـەرانی شـاخ هەیانبوو هەرگیز نووسەرانی شار نەیانبوو.

لەبەرئەوە وتار لە رۆژنامەو گۆڤارەكانی ناو شاردا پاشەكشەی كـرد بەرامبـەر ئەوە لەبڵاوكراوەكانی شـاخ واتـا نـاو شـۆڕش بایـەخی زۆری پێدەدراو زیـاتر گەشەی دەكرد لەبەرئەوە نووسـەرانی شـار هـەوڵیان دەدا لـە رێگـەی وتـارە كۆمەڵایەتی و و مێژوویی و رۆشەنبیرییە گشتییەكاندا بیرو بۆچوون و هەسـت و سۆزی نەتەوایەتیان پیشان بدەن.

وەك لـەم دەقـەی (سـەبری بۆتـانی)دا نووسـراوە كـە سـاڵی (١٩٨٣)دا بڵاوكراوەتەوە:-

**((ئـەدەبا كـوردی ژ سـترانا زمانـێ كـوردی ڤـە دەسـت پێكریـە. لێ مخـابن نەهاتییـە نڤیساندن.... ئەزڤێ دبێژم چكۆ بێگومان ئەگەر سترانەك تـەنێ ژی بـەری چـەند هـزار ساڵەكا بهاتـا نڤیسـاندن مەو بیانیـا ژی دێ بگۆتـا ژهنگـێ ڤـە پەیـدا بوویـە. ڤێجـا گەرەكە باشتر بهێتە زانین كو سترانا كـوردی شـعرە، سـەر هاتییـە، چیرۆكە، پەسـنە، رێزگرتنە، بیروباوەڕە، شیرەتە، ئەڤینە، ئۆل و ئاییینە، كورت و كرمانجی شین و شـادی وفەلسەفا ژینا میللەتێ مەیە.......)).**

تەنها بۆ خوێندنەوەیە

## فەرهەنگۆك

| | |
|---|---|
| لێ مخابن | : بەڵام بەداخەوە |
| چکۆ | : چونکە |
| دێ بگۆتا | : دەمانگوت |
| ژهنگێ ڤە | : لەو کاتەوە |
| پەسنە | : وەسفە |
| شیرەتە | : ئامۆژگارییە |

## چیرۆکی کوردی لە جەنگی دووەمی جیهانییەوە

چیرۆکی هونەری وەك بابەتێکی ئەدەبی تازەی بێگانە هاتە ناو ئـەدەبی کوردی یەوە، لە بنەڕەتدا هونەرێکی ئەوروپییە پێویستی ژیان وای کـردووەو وەکو ڕوخسارێکی هونەری لەناو هـەموو نەتـەوەکانی جیهانـدا بڵاوببێتەوەلـە کۆمەڵگای کوردیش وەزعی لەباری تایبەتی خۆی بۆ هەڵکـەوت ئینجـا سـەری هەڵداو پێگەیشت، ئاشکراشە هەموو داهێنانێکی نـوێ سـادەو سـاکار دەسـت پێدەکات ئینجا قۆناغ لە دوای قۆناغ گەشـەدەکات و پێشـدەکەوێت، دەبێـت ئەو ڕاستییەش بزانین کە بێ ئەو سەرەتایە ئەوەی ئێستاهەیە نەدەبوو دوای ئـەوەی لەقۆناغـەکانی پێشـووی خوێنـدن باسـی سـەرەتاو سـەرهەڵدانو دەرکـەوتنی چـیرۆکی هونـەری کوردیمـان کـرد ئـەوا لەجـەنگی دووەمـی جیهانییەوە چیرۆکی هونەری کوردی بە پێی چەند قۆناغێکی مێژوویی دابەش دەکەین بەم شێوەیەی خوارەوە.

١- چیرۆکی هونەری کوردی لەساڵی ١٩٣٩ تا ساڵی ١٩٥٨

٢- چیرۆکی هونەری کوردی لەساڵی ١٩٥٨ تا ساڵی ١٩٧٠

٣- چیرۆکی هونەری کوردی لەساڵی١٩٧٠ تا ساڵی ١٩٩١

## ١- چیرۆکی هونەری کوردی لەساڵی( ١٩٣٩ - ١٩٥٨)ز

دەتوانین ئـەم قۆناغـە نـاو بنـێین بـە قۆنـاغی گەشەسـەندنی چـیرۆکی هونەری کـوردی، چـونکە لـەم قۆناغـەدا هونـەری نووسـینی چـیرۆکی کـورت نـەش‌ونمای کـرد کـە لێـرەدا دەرچـوونی چـەند گۆڤـارو ڕۆژنامەیـەك ڕۆڵێکـی بەرچاویان هەبوو لە گەشەسەندنی وەکو گۆڤارەکانی گەلاوێژ، دەنگـی گێتـی تازە لە بەغـدا هـاوارو ڕۆژا نـوو لـە شـام "شـەفەق" لـە کـەرکوك، ڕۆژنامـەی "ژیـن" و "ژیـان" لـە سـلێمانی لێـرەدا باسـی چـیرۆکی کـوردی دەکـەین لـە گۆڤاری گەلاوێژ و گۆڤاری هاوار....

## چیرۆکی کوردی لە گۆڤاری گەلاوێژ(١٩٣٩-١٩٤٩)ز

یەکێك لەو هونەرە ئەدەبییانەی گۆڤاری گەلاوێژ لە (١٩٣٩- تـا ١٩٤٩) ڕۆڵێکی ئاشکراو دیاری لە جـێگیر بـوون و ڕەگ داکوتـانیـدا هـەبووە چـیرۆکی هونەری کوردییە. (گەلاوێژ) هەرلە یەکەم ژمارەیەوە گۆشەیەکی تایبـەتی بـۆ چیرۆك داناوە ناوی (چیرۆکی ئەم مانگە)ی لێناوە کە لەسەرجەم ژمارەکـانی ئەم گۆشەیە دەبینرێت تا دوازمارەی کە ژمارە (١١٦)یـە چـونکە بەبەشـێکی سەرەکی ئەدەبی نوێیان زانیوە، هەر لەم گۆڤارەدا ئاوڕ دانـەوە لـە چـیرۆکی وەرگێڕاو کارێکی زۆر بەجێ بووە بـۆ چـاوکردنەوەی لاوەکـانی ئەوسـاش بـە کەڵك بووە بەتایبەتی چیرۆکە وەرگێڕاوەکـان هـی ئـەو نووسـەرانە بـوون کـە ناوبانگیان هەبووە لـە جیهانـدا.... سـەرنجی خوێنـەرو نووسـەرانی کوردیـان ڕادەکێشـا بۆئـەم ناوانـە (بـەلزاك، مەکسـیم گـۆرکی، چـیخۆف، مۆپاسـان، ئەندرسـن، تۆلسـتۆی، جـبران خلیـل جـبران، توفیـق حکـیم...هتـد) چـیرۆکەکانیش زیـاتر لـە زمـانی ئینگلیـزی وەردەگێـڕدران هەندێکیشـیان لـە زمانی عەرەبییەوە.

بابەتێکی دیاری ناوەرۆکی چیرۆکەکانی ئەم قۆناغە ناکۆکیو ململانێی نێوان دووچینی سەرەکی کۆمەڵ بوون، دەرەبەگو ئاغاکان لەلایەکو جوتیارو ڕەشو ڕووتی کوردستان لەلایەکی ترەوە کە وێنەی ژیانی پڕ مەینەتی ئەو ڕۆژانەی شەڕی دووەمی جیهانی بوون، هەر لە پای ئەو بابەتەدا ڕەخنە گرتن لە نەریتو خووڕەوشتی دوواکەوتووی کۆمەڵایەتی بووە بابەتێکی تری چیڕۆك لەو ماوەیەدا. لە چیرۆکەکانی (گەلاوێژ) ئەوەش دەبینرێت کە نووسەرەکان بەتەواوی لایەنگیری جوتیارن هەروەها لە بەشێك لە چیرۆکەکانی (گەلاوێژ) ئافرەت کراوە بە پاڵەوانی چیرۆك، پەنجە بۆ ئەو نیوەی کۆمەڵە درێژکراوە، باسی هەندێك دەردەکانی چەوساندنەوەی ئافرەت کراوە وەك شیربایی، کچ فرۆشتن، مەبەستی نووسەرەکانیان ڕەخنە گرتن بووە لە دواکەوتوویی کۆمەڵگەو لەوانەی دەبنە هۆی ئەم دواکەوتنە.

هەر ئەم چەشنە بایەخدانەی چیرۆکنووسانی کورد بەو کێشەو دیاردە کۆمەڵایەتییانە بووە هۆی ئەوەی کە ڕاستەوخۆ چیرۆکی کوردی بەرەو ڕێبازی ڕیالیزمی هەنگاو بنێت، دیارترین چیڕۆك نووسەکانی گەلاوێژ، (شاکر فەتاح، عەلائەدین سجادی، برایم ئەحمەد)بوون.

## تەکنیك و زمانی دارشتنی چیرۆکەکان:

ئەگەر چی چیرۆکەکانی سەرەتا چ لە ڕووی زمانەوە بێت کە لە ڕووی تەکنیکییەوە پێشکەوتنی ئەو تۆیان پێوەدیار نییە واتا زمانی نووسینی چیرۆکەکان کوردی پەتی نییە وەکو زمانی نووسینی ئەو سەردەمە، پڕیەتی لە وشەی عەرەبی و فارسی هەروەها لە ڕووی تەکنیکییەوە بەگشتی شێوازی چیرۆکەکان گێڕانەوەی ئاساییەو هیچ کاریگەرییەکی هونەری نوێی چیرۆکی پێوەنییە، زیاتر شێوەی ڕاپۆرت نووسینیان پێوەدیارە یاخود گەلێ چیرۆکنووس تەقەلایان داوە باسێکی فۆلکلۆری یا ئەفسانەیی بێنن بەرگی چیرۆکێکی هونەری بەبەردا بکەن.

لەم قۆناغەدا زمانی چیرۆکەکان بەرەو کوردی پەتی سفت وڕەوان دەڕوات پاك دەبێتەوە لە وشەی بێگانە لە جێگایان وشەی کوردی ڕەسەن یان وشەی گونجاو بەکارهێنراوە. هەروەها شێوەی هونەری نوێ و تازەتر بەکارهاتووە، واتا دەتوانین بڵێین چیرۆکەکانی گەلاوێژ لەڕووی تەکنیکی هونەرییەوە لەچاو پلەی پێش خۆیان بەرەو پیش چوون سیمای هونەری نوێیان پێوەدیارە، ڕستەو وەسفەکان بەسۆزو کاریگەرن و زنجیرەی باسەکان هەر لەسەرەتاوە تا ئەنجام باش بەیەکەوە بەندن و خوێنەر ڕادەکێشن بۆ چێژ لێوەرگرتنیان.

## چیرۆکی کوردی لە گۆڤاری هاوار ( ١٩٤١ - ١٩٤٣)ز

گۆڤـاری (هـاوار) لـە سـاڵی (١٩٣٢ز) کـە لـە شـام دەردەچـوو لـەم قۆناغـــەدا واتـــە لـــە ســـاڵانی(١٩٤١ تـــا ١٩٤٣) بایـــەخی زۆری داوە بـــە بڵاوکردنەوەی چیرۆك لە نرخ و بەهای ئەم هونەرە تازەیە باش تێگەیشتووە.

لەسـەر لاپـەڕەکانی ئـەم گۆڤارەشـدا چـەند چیرۆکنووسـی بـە توانـاو بەهرەمەنـد هەڵکـەوتن کـە دیارترینیـان (جـەلادەت بـەدرخان و کامـەران بـەدرخان، قـەدری جـان، ئوسمـان سـەبری ، نـورەدین زازا.... هتـد) بـوون چـیرۆکەکانی گۆڤـاری هـاوار بـە شـێوەی کرمـانجی ژوورو بەشـی بۆتـانی نووسراون، هەندێکیان بە چیرۆکی هونەری دادەنرێن چونکە پلـەی هونـەریان بەرزە هەندێکی تریشیان سیمای حەکایەتی فۆلکلـۆری کوردییـان پێوەدیـارە هەندێکی تریشیان لەسەر زمانی گیانداران نووسراون...

لە ڕووی ناوەرۆکەوە زیاتر هەوڵیان داوە مەسەلەی نەتەوایەتیو خەباتی چینایەتی بخەنە ڕوو ڕەخنە لە ناهەمواری ناو کۆمەڵگا بگرن هەروەها دەردی هەژاریو نەخوێندەواری بخەنە ڕوو ئەم گۆڤارەش بایـەخی داوە بـە چـیرۆکی وەرگێـڕاو بەتایبـەتی لـە زمـانی فەڕەنسـی و عەرەبییـەوە دەکرانـە کـوردی هەنـدێك جـاریش هـەر چـیرۆکە کوردییـەکان لـە هـەمان ژمـارەدا کـراون بەفەرەنسی کە ئەمەش ئەزموونێکی تازە بووە لە ئەدەبی کوردیدا.

لـــەڕووی تەکنیکیشـــەوە بەشـــی هـــەرە زۆری چـــیرۆکە نووســـراو و بڵاوکراوەکان لە ئاستێکی هونەری پێشکەوتوودان و تـەواو وتۆکمـەن چـونکە چیرۆکنووسەکان زمانی فەڕەنسی و ئەڵمانی و ئینگلیزییان زانیوە.

## چیرۆکی کوردی لە گۆڤاری شەفەق (١٩٥٨)

لـە سـەرەتای سـاڵی ١٩٥٨ لـە شـاری کـەرکووك گۆڤـاری ((شـەفەق)) دەرچوو کە رۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە پێشخستنی چیرۆکی هونەری کـوردی بۆ نموونە:ـ

گرەوێکی رێکخست بۆ باشترین (٣) سێ چیرۆکی کوردی بۆ ئەم مەبەسـتەش سێ خەڵاتی تەرخان کرد کە لە ئەنجامدا چـیرۆکی (چـای شـیرین)ی (حسـین عـارف) پاداشـتی یەکـەمی وەرگـرت کـە بـەناوی خواسـتراوی (محمـد صـدیق عارف) بڵاوکرایەوە، چیرۆکی (چەندم لێ ئەستێنی)ی (مستەفا صـالح کـەریم) پاداشتی دووەمی پێدرا، چیرۆکی (شەوێکی درێژ)ی (محەمەد ساڵح دیـلان)ی شاعیریش پاداشتی سێیەمی پێدرا.

لەم ماوەیەدا چـەند چیرۆك نووسـێك بـۆ یەکـەم جـار دەسـتیان دایـە بڵاوکردنــەوەی چـیرۆکی کـورت کـە لـە قۆناغـەکانی دواتـریش هــەر ناویـان دەدرەوشێتەوە وەکو (حسێن عارف ـ محەمەد مەولود (مەم) ـ شێخ مارف بەرزنجی ـ جەمال بابان ـ محـەرەم محەمـەد ئـەمین ـ کاکەمـەم بۆتـانی ـ حەسەنی قزڵچی ... هتد).

لەم قۆناغەدا چەند چیرۆکنوسێك چیرۆکی مـام ناوەنـدی بـۆ یەکـەمین جـار بڵاودەکەنـەوەو جـێگیری دەکـەن لەوانـە (جـەمال بابـان) بـە چـیرۆکی (خـانزاد)و (پەڵـە هـەورێکی چـڵکن)، (جـەمال نەبـەز)یش بـە چـیرۆکی (لالـۆ کەریم)و (محمد صالح سعید)یش بە چیرۆکی (کاروانی)... کـە ئـەم چـیرۆکانە ماوەی ڕووداوەکانیان زیاترە لە هی چیرۆکی کورتو ژمارەی کەسەکانیشـیان زیاترە لە هی چیرۆکی کورت بەڵام ناگەنە چیرۆکی درێژ واتا (ڕۆمان).

دەبێت ئـەوەش بـزانین کـە پێشـتر دوو چـیرۆکی مامناوەنـدی نوسـراونەتەوە بـەڵام لەبـەر ئـەوەی لـەکاتی خۆیـدا بـە کتێـب بـڵاو نەکراونەتـەوە بۆیـە نەیانتوانیوە ئەم چیرۆکە لـە کـاتی خۆیـدا جـێگیر بکـەن کـە چـیرۆکەکانیش (لەخـەوما)ی (جـەمیل صـائیب)و (مەسـەلەی ویـژدان)ی (ئەحمـەد موختـار جـاف)بـوون کـە یەکـەمیان لـە سـاڵی (١٩٢٥) نوسـراوەتەوەو لـە سـاڵی (١٩٧٥)چـاپ کـراوە، دووەمیشـیان لـە سـاڵی (١٩٢٩)نوسـراوەتەوە و سـاڵی (١٩٧٠)چاپکراوە.

## ٢- چیرۆکی هونەری کوردی لە ساڵی (١٩٥٨- ١٩٧٠) ز

لـەم قۆناغـەدا بـەدوواوە بـەهۆی ئـاڵۆزبوونی بـاری سیاسـی وڵات وبەرپابوونی شۆڕشی نەتەوەیی ئەیلوول لە سـاڵی ١٩٦١ دژی ڕژێمـی قاسـم، ئەدەبی کوردی بەسەردەمێکی شەوزەنگ و تاریك تێپەڕی، چونکە بە ئاشکرا بەربەرەکانی چاپەمەنی کوردی دەکرا، ئـەم بارودۆخـەش کەبەسـەر مێـژووی نەتەوایەتیماندا هات پەردەی نائومێدی باڵی کێشا بەسـەر ئـەدەبی کوردیـدا چەند ساڵانێکی خایاند، دیارە چیرۆکی کوردیش کپی و سسـتی و دواکـەوتنی بەخۆیەوە بینی، بەڵام ئەم بارودۆخە هەر وا نەمایەوە، لە ناوەڕاستی سـاڵانی شەستدا چیرۆکی کـوردی تـا ڕادەیـەك پشـووی پیـا هاتـەوە، چـەند گۆڤـار و ڕۆژنامەیەکیش دەرچوون و زەمینـەیەکی لەباری بۆ رەخسا کە جارێکی دیکـە پێش بکەوێتەوە و هەندێك لە چیرۆکنووسەکانی ئەم قۆناغە(مارف خەزنەدار، جەمال بابان، کاکە مـەم بۆتـانی، دکتـۆر کـاوس قـەفتان، ئەحمـەد محەمـەد ئیسماعیل و هەندێکی تریش).

## چیرۆکەکانی ئەم سەردەمە دوو جۆری سەرەکین:

– هەندێکیان زۆر سادەن‌و بابەتەکانیان دوور لە ڕوخساری هونەری خراونەتە بەرچاو، لە جوغزێکی نائومێدی دەخولانەوەو پێشکەوتنیان بەدەست نەهێناوە.

– بەشێکی تریشیان گەشەو پێشکەوتنیان پێوە دیارە، چ لە ڕووی ناوەرۆك‌و ڕووالەتی هونەری‌و ڕەوانی زمانەوە بێت چ لە ڕووی ئەوەی کە مۆرکی کوردەوارییان پێوە دیار بێت، قارەمانەکانیان کەسانی ناو کۆمەڵی کوردەواری بوون، ڕووداوەکانیش ڕووداوی سەردەمەکە بوون، ناوەرۆکی چیرۆك لەم قۆناغەدا بایەخی بە کێشەی سیاسیی و کۆمەڵایەتی‌و چینایەتی سەردەمەکە داوە.

لەم قۆناغە بەدواوە چیرۆکنووسەکان هەوڵیان داوەزۆر بە ئاشکرا باسی بابەتە سیاسیەکان بکەن لەبەر ئەوەی چیرۆکنووسەکان زۆربەیان لەگەڵ شۆڕشی کورد و سەر بەبزووتنەوەی نیشتمانی بوون چ بە بیرو باوەڕ بێت یان بەکردار، ڕۆژانەش بە چاوی خۆیان چەوساندنەوەو ڕاوو ڕووت و زوڵمو ئەشکەنجەدانی گەلەکەیان دەدیت بەدەستی ڕژێمی داگیرکەری کوردستان، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە نرخی هونەری چیرۆکەکان بێتە خوارەوە لە داهێنان بکەوێت، زمانی چیرۆکەکان سادە بن، شێوەو تەکنیکیان لاواز بێت. بە ئاشکراش مەبەست بدەن بە دەستەوە، هەندێك جاریش بارو دۆخی سیاسی پوختی و ڕەوانی پێشووی لاواز کردووە لە ڕووی دارشتنداچیرۆکەکانی بەرەو چرکردنەوە بردووە تا ڕادەیەکیش ڕەمزییان بەکارهێناوە

## ٣- چیرۆکی هونەری کوردی لە ساڵی (١٩٧٠ - ١٩٩١)ز

ساڵی ١٩٧٠ بە قۆناغێکی نوێ دادەنرێت لە مێژووی گەلی عیراق بە گشتیو گەلی کورد بەتایبەتی لەبەر ئەوەی لەو ساڵەدا بۆ یەکەمین جار حکومەتی عیراق دانی بە مافە ڕەواکانی گەلی کورد نا، لە ڕێکەوتنامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ کە لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕشی گەلی کورد مۆری کردبوو، ئەمەش بەماوەی گەشەسەندنو ئاڵوگۆڕ دادەنرێت لە هەموو ڕوویەکەوە دیارە ئەمەش زەمینەیەکی لەبارو ڕێگە خۆشکەر بوو بۆ ئەوەی چەندین دەزگای ڕۆشەنبیری کوردی بێتە کایەوە، هەروەها کۆمەڵێك ڕۆژنامەو گۆڤاری جۆراوجۆر بە زمانی کوردی دەربچن وەکو ڕۆژنامەکانی (هاوکاری– برایەتی– بیری نوێ– ژین) هەروها گۆڤاری (بەیانو ڕۆژی کوردستانو رۆشنبیری نوێ) کە هەموو ئەمانەش زەمینەیان بۆ بڵاوکردنەوەی کۆمەڵێك چیرۆك لەو گۆڤارو ڕۆژنامانەدا لەگەڵ چاپ کردنی چەندین کۆمەڵە چیرۆك.. کە دواتر بوون بە هۆی گەشەسەندنی زیاتری چیرۆکی کوردی چ لە ڕووی ڕووخسارەوە بێت یان لە ڕووی ناوەڕۆك، خۆ دەرچوونی بەیانی (ڕوانگە) لە بەهاری ساڵی (١٩٧٠) یەکێك بوو لەو هەوڵ و ڕێبازە نوێیانەی کەوای کرد ژمارەیەك چیرۆکنووس پەیدابن جگە لە سازدانی کۆڕی ئەدەبیو زاڵبوونی کەشو هەوایەکی باش بۆ گفت کردن لەسەر باری ڕۆشنبیری گشتی، ڕوانگە چیرۆکی کوردی لە سستیو جوینەوە ڕزگار کرد. قەوانە کۆنەکانی لە ئەدەب وردوخاش کرد زەمینەیەکی نوێی بۆ چیرۆکی کوردی ئامادە کرد، دیوارێکی لە نێوان چیرۆکی کۆنو نوێدا دروست کرد. بە تەکنیکی تازەو بەکارهێنانی دیالۆگ و مەنەلۆگو چڕکردنەوەی گێڕانەوەو بەکارهێنانی تەوژمی هۆش ئاستی چیرۆکی کوردی بەرز کردەوە. لەسەرەتای ساڵانی حەفتادا کۆمەڵێك

چیرۆکنووسی قۆناغەکانی پێشوو بەردەوام بوون بەڵام بە بۆچوونی تازەو کەرەستەی تازەوە بەردەوام بوون، وەك چیرۆکنووسان (حسێن عارف و محەمەد مەولود (مەم)و کاکە مەم بۆتانیو مستەفا سالح کەریم و ئەحمەد محەمەد اسماعیل)..هەروەها چەند چیرۆکنووسی تازەش بۆ یەکەمین جار دەستیان بە نووسینی چیرۆك کرد کە دواتر ناوبانگیان پەیدا کردو بەردەوامن تاوەکو ئێستا وەکو (محەمەد موکری و محەمەد فەریق حەسەنو رەئوف بێگەرد و ئەنوەر محەمەد تاهیرو دکتۆر نافیع ئاکرەییو شەعبان مزویری و شێرزاد حەسەن...)

لەم قۆناغەدا دوو ڕووداوی تر کاریگەرییان بەسەر ڕەوتی چیرۆکی کوردییەوە هەبوو کە ئەوانیش شکستی شۆڕشی مەزنی ئەیلوول بوو لە ناوەڕاستی سالانی حەفتادا، ڕێك لە سالی ١٩٧٥ بە پیلانی دوژمنانی کورد. هەروەها هەلگیرساندنی شەڕی ١٩٨٠- ١٩٨٨واتە شەڕی درێژ خایەنی هەشت ساڵەی نێوان عیراقو ئێران، بمانەویو نەمانەوێ ئەم ڕووداوانە کاریگەرییەکی زۆریان بەسەر چیرۆکی کوردیو ئەدەبی کوردی بەگشتی هەبوو، لەسالی ١٩٧٠ بەدواوە بەشێوەیەکی گشتی بابەتەکانی چیرۆکی کوردی گۆڕان هەرچەندە هەندێ لەو بابەتانەی پێشوو دووبارە دەبنەوە بەڵام لەپاڵ کێشەی کرێکارو خاوەنکاری دەوڵەمەند، گیرو گرفتی شاریش بووە هەوێنی چیرۆك.. لەدوایی سالی ١٩٧٥ جۆرە چیرۆکێك پەیدابوو کە دەتوانین ناوی بنێین چیرۆکی بەرگری لە مافە ڕەواکانی گەلی کورد چونکە پاش شکستی ١٩٧٥ بوونو مانەوەی کورد کەوتە مەترسی، تاوانی لەناو چوون و جینۆساید بە ئاشکرا بەرامبەر کورد پەیڕەو دەکرا کورد کەوتە بەرامبەر هێزێکی دڕندەی وەك بەعس کە خاوەن تازەترین چەك بوو، بۆیە

چیرۆكنووسـه كوردەكـان ئـەركێكی پیرۆزیـان كەوتـە سەرشـان كـە ئـەویش داكۆكی كردن بوو لە نەتەوەی خۆیانو هاندانی خەڵك بوو بۆ بەرگری كـردنو هۆشیاركردنەوەی كورد لەڕووی بـیرو بـاوەڕەوە.... چـیرۆكەكانی كاكـه مـەم بۆتـانیو محەمـەد مـوكریو محەمـەد فـەریق حەسـەنو ڕەئـووف بێگـەردو ڕەئـووف حەسـەن شـاهیدی ئەمانـەن، ئەمـە لـەڕووی ناوەرۆكـەوە لـە ڕووی ڕووخساریشەوە دەتوانین بڵێین:-

(١) چیرۆكی كوردی لەم قۆناغەدا سوودی لـە بـەیتو لاوك و داسـتانی كـۆنی فۆلكلۆری وەرگرتووە كەئەمەش ئاوڕدانەوەیەكی پیرۆز و سەرەتایەكی لـەبار بـوو بـۆ چیرۆكنووسـانمان كـە ئـاوڕ لـە گەنجینـەی (بـەیتو لاوكـی)كـوردی بدەنەوە و بەكاریان بێنن بۆ خستنەڕوو و بەرجەستەكردنی هیوا و خەمەكانی مرۆڤی كوردی هاوچەرخ وەك لـە چـیرۆكی (لاوكـی سـوارەی محەمـەد فـەریق حەسەن) و (بەیتی سمۆ)ی ڕەئووف بێگەردو (هێڵەگ)ی عەبدوڵلا سەراج...

(٢) هەروەها لە چیرۆكی كوردی (جەفەنگ)واتە ڕەمز بە شێوەیەكی فـراوانو بەربڵاو بەكار هێنراوە كـە شـێوەیەكە لـە شـێوەكانی تـەكنیك بـۆ جوانكـاری بــەكاردێت، هــەروەها بــۆ داپۆشــین و شــاردنەوەی ئەســڵی مەبەســتی چـیرۆكنووس بەتایبـەتی لـەو بارودۆخانــە ڕێــی دەربڕینــی ڕاسـتەوخۆ لــە نووسەران دەگیرێت بەهۆی بـارودۆخی سیاسـی تونـدو تیـژی داگیركـەران بـۆ نموونە (ڕەوە بـەران) ڕەمـزی داگیركـەرە یـان شـەڕ خوازییـە... (دار بـەڕوو) ڕەمزی كوردو خۆڕاگری كوردو ڕەگ داكوتانی ئەوە لە ناو خـاكی كوردسـتان (ئەسپ) زۆر جار ڕەمزی شۆڕشە.

(٣) چیرۆكی كوردی لەم قۆناغەدا سوودی لە هونەری سینەما وەرگرتووە كە ئەمەش چەكێكی تازەی دایە دەست نووسـەر، بـووە هـۆی شكاندنی قـاڵبی

خۆبەستنەوەی چیرۆکنووس لە کاتێکی دیاریکراو کە ئەمەش لە چیرۆکەکانی (حسێن عارف، شێرزاد حەسەن و محەمەد موکری، ئەحلام مەنسوور، ئەنوەر محەمەد تاهیر، عەبدوڵلا سەراج) دەبینرێت.

(٤) کاریگەری ئەدەبی بێگانە واتە چیرۆکی گەلانی تر زۆر بەئاشکرا دیارە بەسەر چیرۆکەکانی ئەم قۆناغەدا بەتایبەتی چیرۆکەکانی ئەمریکای لاتینیو ئەڵمانیو ڕووسی.. بەشێوەیەکی ئاشکرا لە نیوەی دووەمی ساڵانی حەفتاو هەشتادا ئەمەش شتێکی ئاساییە چونکە دەکرێت سوود لە ئەزموونی چیرۆکی گەلانی تر وەربگیرێت بۆ دەوڵەمەند کردنو بەرەو پێش بردنی ئەزموونی چیرۆکی خۆمان.

(٥) لە ڕووی زمانەوە ناکرێت بڵێین کە زمان لای هەموو چیرۆکنووسەکانی ئەم قۆناغە وەکو یەك یا بەیەك ئاست ناو بنرێت بگرە لای چیرۆکنووسیش لە کۆمەڵە چیرۆکێکەوە وەکو ئەوەکەی تر نییە زمان لای هەندێك چیرۆکنووس زۆر سادەو ساکارە درێژە پێدەری زمانی نووسینی چیرۆکە لە قۆناغەکانی پێشوو تر لەگەڵ گۆڕانکارییەکی کەم بەڵام لای هەندێك چیرۆکنووسی تر زمانی نووسینی چیرۆکەکان جیاواز ترو چڕوپڕ ترو تۆکمەتر بوو، بۆ نموونە چیرۆکنووس (شێرزاد حەسەن) بەئاشکرا خاوەن زمانێکی دەوڵەمەندی تایبەت بە خۆیەتی زمانی شیعر زاڵە بەسەر زمانی چیرۆکەکانی دا کە خوێنەر ڕادەکێشێت وای لێدەکەن چێژ لە خوێندنەوەی چیرۆکەکانی وەربگرن ئەمەش بە ئاشکرا لە هەردوو کۆمەڵە چیرۆکەکانی (تەنیایی) و (گوڵی ڕەش) دیارە کە یەکەمیان لە ساڵی ١٩٨٣ز دووەمیشیان لە ساڵی ١٩٨٩ بڵاوکراونەتەوە...

زمان لای (حسێن عارف)یش زمانێکی کوردی تۆکمەو بە پێزە بەتایبەتی لە کۆمەڵە چیرۆکەکانی (تویشووی سەفەرێکی سەخت) و (گەلەگورگ) کە یەکەمیان لە ساڵی ١٩٧٩دا بڵاو کرایەوەو دووەمیان لەساڵی ١٩٨٣ بڵاو کراوەتەوە بەتایبەتی لە کۆمەڵە چیرۆکی (گەلە گورگ) زمان زۆر دەوڵەمەندترو شیرینترو سەرنج ڕاکێشترە لەچاو هەموو چیرۆکەکانی پێشووی.

# ڕۆمـــان لە ئەدەبــی کــوردیدا

ڕۆمان واتــە چـیرۆکی درێـژ کـە ڕووداوەکـانی زۆر چڕو پـڕن، مـاوەی ڕووداوەکـانی زۆر دوور و درێـژترن لــە هــی چـیرۆکی کـورت و چـیرۆکی مـام ناوەندی هەروەها ژمارەی کەسەکانیشی زیاترن لە هی چیرۆکی کـورت و مـام ناوەندی پێویستە ئەوەش بووترێت کە تا ئێستاش سـنووری نێـوان ڕۆمـان و چیرۆکی درێژ بە وردی دەست نیشان نەکراوە.

ڕۆمان نووسین یەکێکـە لـە هونـەرە ئەدەبییـە گرانـەکان لـە سـەدەی حەڤدەهەمەوە لە ئەوڕوپا سەری هەڵداوە بـەڵام چـەرخی زێڕینـی ڕۆمـان لـە ئـەوڕوپا سـەدەی نۆزدەهـەم و نیـوەی یەکـەمی سـەدەی بیسـتەمە، زۆر لـە ڕەخنەگران ڕۆمان بەداستانی سەدەی تازە ناودەبەن، نووسینی ڕۆمان لە ناو دەوڵەتانی ڕۆژهەلات زۆر دواکەوتووە لە چاو گـەلانی ڕۆژئـاوا.... لـە کاتێکـدا دەیـــان ڕۆماننووســـی نـــاوداری وەك تۆلســـتۆی، هـــەمنگوای، بـــەلزاك، دیستۆفیسکی، گۆرگی.....هتد. لـە ئـەورووپاو لـە هـەموو جیهـان ناوەکانیـان دەدرەوشێتەوە، ڕۆمانەکانیان بەبەردەوامی وەردەگێردرێن بـۆ سـەر زۆربـەی زمانەکانی جیهان ئەوا لێرەو لەوێ تاك و تەرا ناوی ڕۆماننووسـانی عـەرەب و فارس و تورك دەبیسترێت، نووسینی ڕۆمان لەناو کورد دا زۆر دواکەوتوو ترە لە چاو نەتەوەکانی تری عەرەب و فارس و تورك چونکە ئەو بارودۆخـەی کـە بۆ نووسەرێکی عەرەب و فارس و تورك هەڵکەوتووە هەرگیز بـۆ نووسـەرێکی کـورد هەڵناکـەوێت بگـرە زۆر جـاریش نووسـەری کـورد دژایـەتی دەکرێـت و دەرفەتی چـاپکردنیش بـۆ نووسـەری کـورد زۆر دژوار و ئەستەمە، لێـرە بـە دواوە زۆر بە کورتی باس لە قۆناغـەکانی دەرکـەوتن و گەشەسـەندنی ڕۆمـان دەکەین بە زمانی کوردی:

## سەرەتای ڕۆمان نووسین لە ئەدەبی کوردیدا

بۆ یەکەمین جار نووسینی ڕۆمان بە زمانی کوردی لە ناو کوردەکانی یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو دەستی پێ کردووە، یەکەمین هەوڵیش لەلایەن نووسەری گەورە "عەرەبی شەمۆ" دراوە کە لە ساڵی ١٩٣٥ز ڕۆمانی "شڤانی کورد" بە دیالیکتی کرمانجی ژووروو بە پیتی لاتینی نوسیووەتەوە ئەم ڕۆمانە دواتر کراوە بە رووسی و فەرەنسی و ئەرمەنی .... ئینجا دواتر هەر "عەرەبی شەمۆ" ڕۆمانەکانی "کوردی ئەلەگەز" و "بەربانگ" و ئینجا لە ساڵی (١٩٦٦ز) "قەڵای دمدم"ی نووسییەوە دوای "عەرەبی شەمۆ" چەند نووسەرێکی کوردی سۆڤیەتی تر دەستیان کردووە بە نووووسینی ڕۆمان لەوانە "حاجی جوندی" کە ڕۆمانی "هەوارێ" و "بەهار هات"ی نووسییەوە، "عەلی عەبدولرەحمان" ڕۆمانەکانی "خاتێ خانم" و "گوندی مێرخاسا"ی نووسی، ئەم ڕۆمانانە بەشێکی زۆریان کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نەبووە لەسەر ڕەوتی گەشەسەندنی ڕۆمان لەناو کوردستاندا چونکە تا درەنگ نەگەیشتوونەتە بەشەکانی کوردستان. نووسەرانی کورد لەناو بەشەکانی کوردستاندا ئەم ڕۆمانانەیان نەخوێندۆتەوەو چاویان پی نەکەوتوونە.

- ڕۆمانەکان بە شێوە زاری کرمانجی ژووروو بە ڕێنووسی پیتی لاتینی نووسراون، زمانی نووسینیان زۆر سادە و ڕەوانە.
- بیر و باوەڕی سیاسی ئایدلۆژیەتی سۆشیالیزمی سۆڤیەتی پێشوو بەسەر ڕووداوەکان زاڵە.
- شێوەی ڕۆمانەکان گێڕانەوەیە وەکو داستان و چیرۆکە فۆلکلۆرییەکان چونکە بناغەی نووسینی ڕۆمانەکانی داستان ئەفسانەو حەکایەتی فۆلکلۆری کوردین دوورن لە تەکنیکی تازەو هاوچەرخ.

## قۆناغی چەسپاندن

لە کوردستاندا وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا تا سالانێکی درەنگی سەدەی بیستەم هیچ ڕۆمانێك بە زمانی کوردی نەنووسراوەتەوە بەلام دواتر دوو هەولی لەبەر چاوو دیار هەن کە دەتوانین بیانکەینە بناغەی بنیادی ڕۆمانی کوردی بە هەر بارێکدا تەماشایان بکەین ناتوانین بە دەست پێشکەرییەکی گەورەیان نەزانین ئەو دوو هەولەش هەردوو ڕۆمانی "پێشمەرگە"ی ڕەحیمی قازی و "ژانی گەل"ی برایم ئەحمەدن، لە سالی ١٩٦٠ز لە شاری بەغدا ڕۆمانی "پێشمەرگە"ی ڕەحیمی قازی چاپکرا، ڕۆمانەکەش ڕووداوەکانی دەربارەی سەردەمی دامەزراندنی "کۆماری کوردستان"ە لە مەهاباد و لە دەوروبەری سالی ١٩٤٦ز، نووسەر چونکە خۆی لە ڕووداوەکان بەشداری کردووە و لەناو جەرگەی ڕووداوەکان بووە بۆیە لە خەباتی ئەو سالانەی کورد دەدوێت، ڕووداوەکان تێکەل بە چەند کێشەیەکی تر دەکات بەتایبەتی کێشەی جوتیار لەگەل دەرەبەگدا پاشان لە سالی ١٩٧٢ز ڕۆمانی "ژانی گەل"ی برایم ئەحمەد هەر لە بەغدا چاپکرا کە نووسەر خۆی دەلێت لە سالی ١٩٥٦ز نووسیویەتییەوە بەلام لەبەر نەبوونی دەرفەتی گونجاو نەیتوانیوە لە کات و سەردەمی خۆیدا چاپی بکات.

ئەم ڕۆمانە زیاتر لە ڕۆمانی پێشمەرگە دەنگی دایەوە و لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو کاتە کۆمەلێك وتار و لێکۆلینەوەی لەسەر بلاوکرایەوە، پێویستە ئاماژە بەوەش بکرێت کە لە حەفتاکاندا ڕێك لە سالی ١٩٧٦ ڕۆمانی ((قەلای دمدم))ی عەرەبی شەمۆ، لەلایەن شوکر مستەفا لە دیالێکتی کرمانجی ژووروو کرابە دیالێکتی کرمانجی خواروو، کە تێیدا نووسەر ڕووداوی مێژوویی و بابەتی فۆلکلۆری لە شێوەی ڕۆمانێکی هاوچەرخی سەرکەوتوو

دارشتووه. زمانی نووسینی ڕۆمانە کوردییەکان لەم قۆناغەدا زمانێکی تۆکمە و کوردییەکی زۆر ڕەوانە کە خوێنەر بۆ خۆی ڕادەکێشێت. ناوەرۆکی ئەم ڕۆمانانە سیماو شەقلی خەباتی نەتەوایەتییان پۆشی بوو ڕووداوەکان خۆماڵین و لەناو جەرگەی کۆمەڵی کوردەواری هەڵهێنجراون بەلام زیاتر کێشەی نەتەوایەتی و خەباتی کورد بۆ سەربەخۆیی زیاتر هەستی پێ دەکرێت. شێوەی نووسین زیاتر گێڕانەوەیە دوورە لە تەکنیکی هاوچەرخ هەروەها دوورە لە تەم و مژ و ئاڵۆزی.

## قۆناغی گەشەسەندن

ئەم قۆناغە لە ساڵانی هەشتای سەدەی بیستەم دەست پێ دەکات کە دوو دیاردەی ئاشکرا دەبینرێت:

١) ژمارەی ڕۆمانی خۆماڵی نووسراو بە زمانی کوردی زیاتر دەبینرێت لە چاو قۆناغەکانی پێشوو.

٢) هەروەها ژمارەی ڕۆمانی وەرگێڕاو لە زمانی بێگانە بە شێوەیەکی بەرچاو زیاد دەکات.

ئەم دوو دیاردەیە لەم سەردەمەدا دوو دیاردەی دڵخۆشکەر بوون بۆ ئەوەی ببنە ڕێگا خۆشکەر بۆ گەشەسەندنی ڕۆمان لە زمانی کوردی، چونکە پێشتر ژمارەی ڕۆمان بە زمانی کوردی لە پەنجەکانی دەست تێنەدەپەرین. بۆ نموونە "حسێن عارف" لە ساڵانی هەشتا هەردوو ڕۆمانی "شار" و "ئەندێشەی مرۆڤێك"ی چاپکرد، "عەزیزی مەلا ڕەش"یش "کوێخا سێوێ" و "غەوارە" خەسرو جاف "کۆردەرە" و "هیچ"ی چاپکرد، عەبدوڵڵا سەراج "هەڵکشان بەرەو لووتکە"ی چاپکرد، دکتۆر نافیع ئاکرەیی "بوهـژین"ی چاپکرد. لە شاخیش دوور لە سانسۆری حکومەت "محەمەد موکری"

ڕۆمانـەکانی "سـەگوەڕ" و "تۆڵـە" و "هـەرەس"ی بـە دوو بـەرگ چـاپکرد، "حەمە کەریم عارف"یش "کۆچی سوور"ی چاپکرد. لە ئەوروپاش بەتایبەتی لە سـوید هەنـدێك ڕۆمـان بـە زمـانی کـوردی چـاپکران لەوانـە ڕۆمـانی "مرنـا کاڵەکی ڕەند" و "هاوارا دیجلـەیێ" محەمـەد ئـوزۆن بـە دیـالیکتی کرمـانجی ژووروو.

دیـــارە ڕووداوی سیاســـی و باســـی خـــەباتی ڕەوای کـــورد، ژیـــانی پێشمەرگایەتی نێو شاخ و داخی کوردستان بووە هەوێنی چاو هەڵهێنانی ئەم بەرهەمە تازانە. زمانی ڕۆمانەکانیش پاراو ترو پوخت تر و چڕتر کراونەتـەوە ئەمـە لـەپاڵ دیـاردەی بایەخـدان بـە شـێوەزاری ناوچـەیی جوتیـاران لـەم ڕۆمانانەدا هەروەها باس لە کێشەی گوند نشینەکان دەکەن وەکو ڕۆمانەکانی عەزیزی مەلای ڕەش. ئەگەر چی لەم قۆناغەشدا شێوازی گێڕانەوە بە زۆربەی ڕۆمانەکانـەوە دەبینرێـت هەسـت بـەوەش دەکرێـت کـە ڕۆمـان نووسـەکان بایـەخیان بـە تـەکنیکی نـوێو مۆنۆلـۆج داوە سـەرکەوتووانەش بـە کاریـان هێناون.

دەبێت ئەوەش بزانین کـە ئـەم قۆناغـە ڕێگـەی خۆشـکرد بـۆ ئـەوەی کـە ڕۆمـــانی کـــوردی لـــە قۆنـــاغی نـــەوەدەکان زۆر زیـــاتر پێشـــبکەوێت، گەشەسـەندنێکی وا بەخۆیـەوە ببینێـت کـە هـەرگیز گەشەسـەندنی وای بـە خۆیەوە نەبینیبێت.

لەپاڵ ئەم ڕۆمانـە کوردییانـەدا کۆمـەڵێك ڕۆماننووسـی کـورد هـەن کـە بـە زمانی بێگانە ڕۆمان دەنووسن بە ڕەچەڵەکیش کوردن و ناوبـانگی جیهانییـان هەیە وەك "یەشار کەمال" کە بە تورکی دەنووسێت و هەندێك لە ڕۆمانەکانی کراون بە کوردی وەك "ئەفسـانەی چیای ئـاگری" و "حەمـەدۆك" بـە چـوار

بەرگ "كاریتە" و هی تر... (سەلیم بەرەكات) بە عەرەبی دەنوسێت كە كوردێكی سوریایە وەك ڕۆمانەكانی "پەڕ" و "دلشاد" كە كراون بە كوردی یان (ئیبراهیمی یونسی) كە بە فارسی دەنووسێت كە ڕۆمانی "دایكم دوو جار گریا" كراوە بە كوردی ئەم ڕۆمانەی دەربارەی كارەساتی ئەنفالكردنی گەلی كوردە لەلایەن ڕژێمی بەعسی درندە، هەروەها، (عەبدولمەجید لوتفی) كە ئەویش بە زمانی عەرەبی ڕۆمانی دەنووسییەوە وەك ڕۆمانی "پێشبینی لێزانە قەرەجەكان" كە كراوە بە كوردی لەلایەن شوكر مستەفا.

ئەگەر چی ئەم ڕۆمانانە لە ڕووی زمانەوە بە كوردی دانانرێن بەڵام لە ڕووی ناوەڕۆكەوە بەشێكی زۆریان باسی ژیان و خەباتی ڕەوای گەلی كورد دەكەن.

## بابا تاهیری هەمەدانی

## ( ٩٣٧– ١٠١٠)ز

بابا تاهیری هەمەدانی، ناوی تاهیرە، (بابا) یان پێ وتـووە چـونکە یـەکێ بووە لە پیاوە چاکەکانی (ئەهلی هەق)ی ئاینی یارسان.

ساڵی لە دایکبوونی بابا تاهیر ئاشکرا نییە، لـە زۆر سەرچـاوە باسـی کـراوە، بەڵام بە پێی سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکان لە مـاوەی نێـوان نیـوەی یەکـەمی سەدەی دەیەم و سەرەتای سەدەی یازدەمی زاینی ژیـاوە، لـە دایـك بـوون و کۆچی دوایی بە ساڵانی (٩٣٧ز – ١٠١٠ز) دیاری کراوە.

شیعرەکانی بابا تـاهیر بـە شـێوەزاری (لـوڕ)ی نووسـراوە، کـە یەکێکـە لـەو شـێوەزارانەی کـە بەشـێك لــە ئــەدەبیاتی کـوردی پێنووسـراوە، زۆربــەی شیعرەکانی بابا تاهیر (دوو بەیتـە) کـە بریتییـە لـە چـوار نیـوەدێڕ، قافیـەی نیوەدێڕی (یەکەم و دووەم و چوارەم) وەکو یەکە، بەڵام قافیەی نیوە دێـری سـێیەم جیـاوازە، جگــە لــە شــیعری (دوو بــەیتی) نزیکــەی (٥) پێــنج (غەزەل)یشی هەیە.

بابـا تـاهیر لـە شـیعرەکانیدا فەلسـەفەیەکی قـووڵ و واتایـەکی بـەرزو جـوان دەدرەوشێتەوە.

### نموونە لە دوو بەیتەکانی بابا تاهیر:

**مەگەر شێر و پڵنگی ئـەی دڵ ئـەی دڵ**
**بەموو دایم بە جەنگی ئەی دڵ ئەی دڵ**
**ئەگەر دەستوم ڕەسەد خونت وەرێـژوم**
**بوینم تا چ ڕەنگی ئـەی دڵ ئـەی دڵ**

## وشە : واتا

موو : من

بەموو: لەگەڵ من

دەستوم ڕەسەد: بکەویە بەر دەستم

بوینم: ببینم

خونت وەڕێژوم: خوێنت دەرێژم

(دیارە تۆ وەکو شێر و پڵنگی ئەی دڵ، هەمیشە لەگەڵ من لە جەنگ دای، ئەگەر بکەویە بەر دەستم خوێنت دەرێژم، بۆ ئەوەی ببینم ڕەنگت چۆنە).

# مەولەوی

## ( ١٨٠٦ – ١٨٨٢)ز

ناوی (عەبدول ڕەحیمی)ە، کوڕی سەعیدە، لە هۆزی (تاوەگۆزەییە)، لە ساڵی **(١٨٠٦ز)** لە خاکی جوانڕۆ لە دێی **(تاوەگۆز)** لە دایکبووە، لە ساڵی (١٨٨٢ز) لە گوندی (سەرشاتە) کۆچی دوایی کردووە. مەولەوی مەلایەکی یەکجار شارەزا بووە، بە تایبەتی لە عەقیدە دەستێکی باڵای هەبووە، لەسەرەتا نازناوی (مەعدومی) ئینجا (مەولەوی) کردۆتە نازناوی خۆی.

لە ڕووی ناوەڕۆکەوە سروشتی کوردستان، کاریگەری تەواوی لەسەر شیعرەکانی مەولەوی هەیە، کە شیعری بۆ هەر چوار وەرزی ساڵ و کوێستانەکانی جافایەتی گوتووە، لەگەڵ شیعری دڵداری و ئاینی و لاواندنەوە و..... هتد.

دیارە کە سەرجەم شیعرەکانی بە شێوەزاری (هەورامی) نوسیوە.

مەولەوی جگە لە دیوانەکەی، چەند بەرهەمێکی تری هەیە، بەتایبەتی لەسەر (عیلمی کەلام) کە دەستێکی باڵای لەو زانستە هەبووە وەك: (الفضیلة، العقیدة المرضیة، الفوائح) و هەروەها نامیلکەیەکی بە زمانی فارسی هەیە، کە باسی ئوسولی تەریقەتی نەقشبەندی دەکات.

## نموونەیەك لە شیعری مەولەوی

ئەم پارچە شیعرە کە دەربارەی سروشتە، تیایدا وەسفی سەرچاوەی (زەلم) دەکات:

١ ) وەهاران سەیرەن، سەوزەی دیــــاران
نـم کەوت نە دیدەش، چون شەو بێداران

٢ ) پـــەی دڵەی مانیای دەروون مەلالان
ســـایە بەستەوە خەیمەی گوڵاڵان

٣ ) بـــۆی یەخەی سەحەر پەی دەماخ دڵ
مانـۆ وەنـەسیم جێب جـەمین گـــوڵ

٤ ) چـــون دێوانـەی شـــۆر ئازیز نەسەردا
شـــە تـاو سەرهۆرگرت وەدەشت و دەردا

٥ ) تـــوولانی چون هیجر خاتـــر پرداران
ڕەوان وێنەی وەصـــڵ گەردن بێ گەردان

٦ ) های جەشنۆی وەش رۆح ئەفزای کاوان
ئـــای جەشاخەی تاف ساف ســـەرداران

**دوو دێری یەکەم بۆ لەبەر کردنە**

## لێکدانەوەی شیعرەکە :

١- واتە: بەهارە وەختی تەماشایە، سەوزە گیای دەشت و کێوەکان ئاونگ نیشتووەتە سەر چاویان، وەك پیاوانی خوا کە شەو ناخەون، بیر لە خوا دەکەنەوەو فرمێسك لە چاویانا دەدرەوشێتەوە.

٢- (مانیا) واتە (ماندوو) واتە: خێوەتی گوڵاڵەکان سێبەریان بۆ دڵی ماندووی پڕ لە خەفەتەکان کردووە.

٣- (مانۆ) واتە (ئەشوبهێ)، (جێب) واتە (سینگ و بەرۆك): بۆنی بەرە بەیان لە هەوای سینگ و بەرۆکی نازداران دەچێت، لە خۆش کردنی دەماخی دڵدا.

٤- (شۆڕ) واتە (عەشق): مانای ئەم دێرە لەگەڵ دێرەکانی دوای خۆی لێك دەدرێتەوە.

٥- (توولانی) واتە (درێژ): لافاوی بەهار سەری خۆی هەڵگرتووە ڕێگای دەشت و دەری گرتووە، وەك دڵدارێك کە عەشقی یار لە دڵی عاشقی دەردەداران، ساف و مەنگە وەك گەیشتن بە یاری گەردن بێ گەرد.

٦- (وەش) واتە (خۆش)، (شاخە) واتە (هارە): مانای ئەم دێرەش لەگەڵ دێری دوای خۆی لێك دەدرێتەوە.

## پرتەوی هەکاری

## (١٧٥٦– ١٨٢٥)ز

ناوی مستەفا بەگی کوڕی عەبدوڵڵا بەگی کوڕی محەمەد کوڕی ئێزدین شێرە، بە بنەماڵە لە میرانی ناوچەی هەکارییە.

نازناوی (پرتەوی هەکاری) یان (شاپرتەوی هەکاری) بۆ خۆی داناوە، لە ساڵی (١٧٥٦)ز، لە ناوچەی هەکاری لە دایکبووە، لەگەڵ ئەوەی زانیاری تەواوی لە ژیانی نەماوەتەوە، بەڵام وەك دەرکەوتووە لە ساڵی (١٨٢٥)ز کۆچی دوایی کردووە.

ناوچەی هەکاری وەك ناوەندێکی ڕۆشنبیری دەوڵەمەند کاریگەری هەبووە، بۆ خەملاندنی چێژو خەیاڵی پرتەو، چونکە ناوچەی هەکاری شوێنی لەدایکبوون و ژیانی هەندێ لە زاناو شاعیرە هەڵکەوتووەکانی وەك (عەلی تەرەماخی و عەلی حەریری و فەقێی تەیران و مەلایی باتەیی و ئەحمەدی خانی) و گەلێکی تر بوون، هەر بۆیە بەناوەندێکی گەورەی خوێندەواری و ڕۆشنبیری لە کوردستانی باکووردا دەرکردووە.

لە ڕووی ڕووخسارەوە، وەکو هەموو شاعیرە کلاسیکەکانی تری ئەدەبی کوردی، شیعرەکانی لە (غەزەل و قەسیدە) پێکهاتووە، جگە لەمانە کۆمەلێك چوارین و پێنجین و موستەزادی هەیە.

لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، موناجات و ستایشی پێغەمبەر و دڵداری و وەسفی خۆشەویست و سروشت، هەموو لایەنێکی شیعرەکانی گرتۆتەوە.

شیعرەکانی بە زاری کرمانجی سەروو نوسراوە، کە یەکێکە لەو زارانەی بەشێکی زۆری ئەدەبیاتی کوردی پێنووسراوە لە کۆن و ئێستادا.

نموونەیەکی شیعری (پرتەوی هەکاری) لە هونەری موستەزاد

**ئیرۆکە م تالیع سەحەرێ دلبەری سەلما**
**مەشیا ب خرامان**
**مەستانە وەش، کە چ کولەهـ و قامەتی ڕەعنا**
**شەنگا شەبی ڕیحان**
**ئەڤ شیوەو ئەڤ عیشوەو ئەڤ ناز و نەزاکەت**
**ئەسلن م نەدی بوون**
**یا رەب ژ هەمی دەردە و بەلا و ئافاتی دنیا**
**حافز کو ب یەزدان**

**( هەمووی بۆ لەبەرکردنە )**

**لێکدانەوەی شیعرەکە :**

١- ئیرۆکە: ئەمرۆکە، م: من، تالیع: بەخت، مەشیا: رۆیشت، واتە (ئەمرۆ بەیانی زوو، بەختم وا دەرچوو، کە دولبەری سەلما رۆیشت بە خەرامان).

٢- وەش: رۆیشت، کە: کو، کو لەهـ: بەرز و قیتو قۆز، واتە (ڕۆیشتنێکی بە لەنجەولارو (سەرخۆشانە) و بەرزو قیت، بەژن و بالای وەکو شەنگەبی ناسک لە شێوەی رێحان).

٣- ئەڤ: ئەم، واتە(ئەم شێوە رۆیشتنەو ئەم عیشوەتەو ئەم نازە و نەزاکەتە هەرگیز هاوتای نییە، من نەم دیوە.

٤- خوایە لە هەموو دەرد و بەلاو ئافاتی دونیا بیپارێزی، لەبەر خاتری ناوی خۆت (یەزدان).

## حەمدی

## (١٨٧٨ – ١٩٣٦)ز

ناوی ئەحمەدە کوری فەتاح بەگی حاجی ئیبراهیم بەگی مەحمود بەگی ساحێبقرانە، لە ساڵی ١٨٧٨ز لە شاری سلێمانی لەدایکبووە، لە شەوی (١٢)ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٣٦)ز کۆچی دوایی کردووە لە گردی سەیوان لە شاری سلێمانی نێژراوە.

شیعرەکانی حەمدی بەزاری کرمانجی خواروو نووسراوە وەك هەر شاعیرێکی کلاسیکی کوردی، کێشی عەرووزی عەرەبی، یەك سەروای بەکارهێناوە، بنیاتی شیعرەکانی جگە لە قەسیدەو غەزەل، گەلێ تەرجیع بەندە و تەرکیب بەند و چوارینی هەیە.

لە ڕووی ناوەرۆکەوە شیعری (نیشتمانپەروەری و ئاینی و دڵداری و وەسفی سروشتی کوردستان)ی هەیە. حەمدی خاوەن بیرو باوەڕێکی کوردانەی بەرزبووە، هەر بۆیە شیعرەکانی ڕاستگۆیانە لە دڵ و دەرونێکی پاکەوە هەڵقوڵاوە.

نموونەیەك لە شیعری حەمدی كە لە ساڵی ١٩٢٧ وتویەتی:

## كوردستان

**ئەی وەطەن ڕۆم و عەجەم موشتاقی كوردستانتە**

**ئیفتخاری میللەتی كورد شەوكەتی عینوانتــە**

**بەستە سەربەرزی ئێواران، سبەینان مانگ و ڕۆژ**

**وەك نیشانی ئیفتخاری سنگ و نەجمەی شانتە**

**بەرق ئەدا و ئەرژێ وەكو ئەمواجی گەوهەر چەشمەكان**

**ئــاوە یــا ڕۆحــی ڕەوانی چەشــمەی حەیــوانتــە**

**ئاوە یا نوورە لە عەكسی خۆر كە ئەبریسكێتەوە**

**ئەهلی حیكمەت وا ئەزانێ دوڕەكانی ( كان ) تە**

**گوڵگوڵی سوور و سپی خاڵخاڵی خاكی ڕەش ئەڵێ**

**بۆ درەیی و روخسار و سورمەی رشتنی چاوانتە**

**عاشقی ڕەنگی خەزانی تۆیە بۆیە دێ بەهار**

**فەسڵی هاوین گەرمە مەیلی بەفرەكەی زستانتە**

**( دوو دێر بۆ لەبەركردنە )**

(كان) واتە مەنجەم، ئەو شوێنەی كانزای لێ دەردێت.

# ڕەوانبێژی

ڕەوانبێژی ئەوەیە قسەو هۆنراوە ڕەوان و جوان و کاریگەر بێ و لەگەڵ بار و دۆخی گوێگر و هەڵوێستی قسەکردنەکە بگونجێت بۆ ئەوەی مەبەستەکەی بە ڕوونی لە خوێنەر بگەیەنێ و چێژی پێ ببەخشێت و کاری تێ بکات. ئەمەش بە هەڵبژاردنی وشەی لەبارو دارشتنی تۆکمە و ڕێکخستنی ژیربێژییانە دێتە دی.

زانستی ڕەوانبێژی لەو هونەر و دەستوور و بنەمایانە دەکۆڵێتەوە کە دەبن بە مایەی رەوانی و جوانی کاریگەری قسەو پاراستنی لە لێڵی و شل و شێواوی.

لێرەدا باسی بەشێکی کەم لە بابەتەکانی رەوانبێژی دەکەین:

## لێکچواندن

**ئ- پێناسەی لێکچواندن :** لێکچواندن لەسەر بنەمای بەراورد هاتووە. بۆ ڕوون کردنەوەو چەسپاندنی سیفەتی شتێك، ئەو شتە لەگەڵ شتێکی تر بەراورد دەکرێت کە سیفەتە مەبەستەکەی تێدا زاڵە، بۆ ئەوەی سیفەتەکە بەم بەراوردە ڕوون بێتەوەو بەزێدەڕەویی دەربکەوێت. ئەو شتەی بابەتی باسەکەیە پێی دەگوترێ (لێچوو) و ئەوەی بۆ بەراورد و ڕوونکردنەوە ناوبراوە پێی دەگوترێت (لەوچوو). سیفەتی هاوبەشی نێوان ئەم دوو بنەڕەتە پێی دەگوترێت (رووی لێکچوون) و دەشێ ئامرازێکیش هەبێت دوو بنەڕەتەکە بەیەکەوە ببەستێت پێی دەگوترێت (ئەوزاری لێکچواندن).

نموونەیەك:

**دڵم هەرووەك سەماوەر پڕ لە جۆشە**
**خەریکی سۆز و گریان و خرۆشە**

لەم دێڕەدا. لێکچواندن لە نیوەی یەکەمدایە. (ناری) دەیەوێ باسی دڵی پڕ جۆش و خرۆشی خۆی بکات. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم جۆش و خرۆشە دڵی خۆی لەگەڵ سەماوەر بەراورد کردووە کە هەمیشە لە کوڵ و جۆشدایە. بابەتی باسەکە دڵی شاعیرە، ئەمە (لێچوو)ە، سەماوەر بۆ ڕوون کردنەوەی سۆز و خرۆشی دڵی شاعیر هاتووە، ئەمە (لەوچوو)ە. سیفەتی هاوبەشەکە جۆش و خرۆشە، ئەمە (ڕووی لێکچوون)ە (هەروەك)یش ئەوزاری لێکچواندنەکەیە.

## ب- بنەڕەتەکانی لێکچواندن:

لێکچواندن بە گشتی لە چوار بنەڕەت پێك دێت:

١- (لێچوو) ئەمە بابەتی باسەکەیە. لە هەموو بنەڕەتەکان لە پێشترە، چونکە باس باسی ئەمە. ئەوانی تر بۆ خزمەتی ئەم هاتوون.

٢- (لەوچوو) ئەمە بۆ ڕوونکردنەوەی لایەنێکی (لێچوو) دێت کە بەراوردەکەی لەسەر بنیات دەنرێت.

ئەم دوو بنەڕەتە (لێچوو و لەوچوو) بنەڕەتی بنچینەیین لە لێکچواندندا. بەبێ ئەم دووە لێکچواندن دروست نابێت هەر کام لەم دووە لابدرێت لێکچواندنەکە نامێنێت.

٣- (ڕووی لێکچوون) سیفەت و لایەنی هاوبەشی نێوان هەردوو بنەڕەتە بنچینەییەکەیە ئەم سیفەتە لە لێکچواندنی ئاساییدا، لە (لێچوو) بێ هێز و لە (لەوچوو) بە هێزە.

٤- (ئەوزار) ئەو وشەیە کە دەوری بەیەکەوە بەستنی هەردوو بنەڕەتی بنچینەیی لێکچواندن (لێچوو و لەوچوو) دەگێڕێ. ئەمە هەندێ نموونەی ئەوزاری لێکچواندنن: (وەك ، وەکو ، هەروەك ، لەو دەکا ، لەو دەچێ ، ئاسا ، چون ، وێنەی ، چەشنی...)

ئەم دوو بنەڕەتەی دواوە (رووی لێکچوون و ئـەوزار) بنـەڕەتی بنچینەیی نـین، بۆیە دەشێ باس بکرێن و دەشێ فڕێ بدرێن.

نموونە:

**دڵم زنجیر ئەکەم ئەمما لـە یـاری دڵڕوبا چ بکەم؟**
**ڕەگم وشکە وەکو پووشە، لە قووەی کارەبا چ بکەم؟**

(قانیع)

لێکچواندن لە نیوەی دووەمدایە ((ڕەگم وشکە وەکو پووشە..)) قانیع ڕەگـی خـۆی لـە وشـکایەتیدا بـە پـووش چـواندووە. بنەڕەتـەکانی لێکچـواندنەکە ئەمانەن:

١- ڕەگی شاعیر: لێچووە

٢- پووش: لەوچووە

٣- وشکایەتی: ڕووی لێکچوونە

٤- وەکوو: ئەوزاری لێکچواندنە

## پ- بنەڕەتە باسکراوەکانی لێکچواندن:

- بـۆی هەیـە هـەر چـوار بنەڕەتەکـەی لێکچـواندن هـاتبن وەکـو دوو نموونەکەی سەرەوە.

- بۆی هەیە سێ بنەڕەت هاتبن ئەمەش دوو جۆرە:

ئـ- بۆی هەیە سێ بنەڕەتە باسکراوەکان (لێچوو و لەوچوو و ئەوزار) بـن و ڕووی لێکچوون نەهاتبێ. نموونە:

**قەسەم بەو شەربەتی دیداری پاکت**
**شەرابم عەینی زەهری مارە بێ تـۆ**

(نالی)

لە نیوەی دووەمدا، لێکچواندنەکە بریتییە لە (شەرابم عەینی زەهری مارە) بەبێ یار شەرابی خۆی بە زەهری مار چواندووە. لەم لێکچواندنەدا، تەنیا سێ بنەڕەت هاتوون.

١- شەرابی شاعیر: لێچووە

٢- زەهری مار: لەوچووە

٣- عەینی: ئەوزارە

(ڕووی لێکچواندن) کە کوشندەییە، نەهاتووە چونکە خوێنەر خۆی دەیزانێت.

ب- بۆی هەیە سێ بنەڕەتە باسکراوەکان (لێچوو و لەوچوو و ڕووی لێکچوون) بن و ئەوزاری لێکچواندن نەهاتبێ، نموونە:

**کوڕ ئایینەیێ جەمالێ زاتن**

**کەچ مەظهەرێ پورتەوا صیفاتن**

(خانی)

لە نیوەی یەکەمدا، لێکچواندن لە (کوڕ ئایینەیێ جەمالێ ذاتن) دایە خانی (کوڕی) بە (ئاوێنە) چواندووە کە جوانی زات پێشان دەدەن.

١- کوڕ: لێچووە

٢- ئایینە: لەوچووە

٣- جەمالی زات پێشاندان: ڕووی لێکچوونە

(ئەوزار) نەهاتووە

– بۆی هەیە تەنیا دوو بنەڕەتە بنچینەییەکە(لێچو ولەوچوو) هاتبن و دوو بنەڕەتە نابنچینەییەکە (رووی لێکچوون و ئەوزار) نەهاتبن وەك:

**دەمێك بوو چاوەڕێ ی بەفرێکی وا بووم مژدە بێ بـاری**
**سەرم بەفرە کەچی هێشتا شەڕە تۆپەڵمە بۆ یـــاری**

(پیرەمێرد)

لێکچواندن لە(سەری شاعیرە) کە بە(بەفر)ی چواندووە.

سەرم: لێچووە

بەفر: لەوچووە

ئەوزار و ڕووی لێکچوون نەهاتووە.

## پرسیار

لەم دێڕە شیعرانەی خوارەوەدا، لێکچواندن دەربێنەو بنەڕەتەکانی لەیەك جیا بکەرەوە:

**١- ئەمن کێوم، سەرم شاخە، هەناسەم**
**نەسیمە، چاوەکانم، مێزەرم، تەم** (حاجی قادری کۆیی)

**٢- قەلبیٚ مە شوبهیٚ زێری ژ فەیزاتە جەلا گرت**
**ما رووسیەه و سیفر سیفەت رەنگی سەدا گرت** (جزیری)

**٣- دیٚ بەتاو ئەشکی دوو چاوم هەروەکوو دیجلەو فورات**
**مەزرەعەی غەم سەوزە، تێراوە لەبەر ئەم دوو شتە** (کوردی)

**٤- تاکەی چون مەجنوون وێڵی هەردان بم؟**
**تاکەی خەمزەدەی باری هیجران بم؟** (مەولەوی)

**٥- لارو لە نجەت، بەستەیە، مۆسیقایە، گۆرانی یە**
**بەژن و بالاکەت نموونەی هەیکەلی یۆنانی یە.** (هەردی)

**٦- نەیلەفەر دل، تو ئافتابی**
**تەن شبهی کەتان، تو ماهتابی** (خانی)

## خواستن

**ئـ- پێناسـەی خواستن:** خواستن ئـەو لێکچواندنەیە کـە تـەنیا یـەکێ لـە دوو بنەڕەتە بنچینەکەی هاتبێ و ئەوی تر نەهاتبێ.

نموونە:

**ئیلاهی! نەرگزا مەی مەست و نازك**

**ژ دەستی خوار و بەدخواهان بپارێز**

(جزیری)

(ئیلاهی: خودایە، مە = ئێمە، ژ: لە ، خوار: لارو خراپ، بەدخواه: بەد نیاز) خواستن لە وشەی (نەرگز) دایە. مانای وشەکە جۆرە گوڵێکە. جزیری یارەکەی خۆی بە (نەرگز) چواندووە (یار) (لێچووە)، (نەرگز) (لەوچووە) (مەست و نازك) (ڕووی لێکچوونە) (ئەوزار) نەهاتووە. بەڵام لەو لێکچواندنەدا دیارە (جزیری) لە دوو بنەڕەتە بنچینەییەکە (یار ، نەرگز) تەنیا یەکێکی هێناوە (لەوچوو – نەرگز). ئەوی تری فڕێ داوە (لێچو – یار) لەم دێڕە شیعرەدا (نەرگز) بۆیار بەکارهاتووە.

نموونەیەکی تر:

**وانەزانی دەستی غەم یادت لە دڵدا دەرئەکا**

**ئەشکی خوێنینم دەلیلە بۆ کەسێ باوەڕ نەکا**

(هەردی)

لەم دێڕە شیعرەدا خواستن لە (دەستی غەم) دایە. لەبەر وشەی (دەست) یەکسەر بیرمان بۆ ئەوە دەچێت کە (غەم) بە (مرۆڤ) چوێنراوە. غەم (لێچووە). مرۆڤ (لەوچووە). ئەمە دوو بنەڕەتە بنچینەییەکەی لێکچواندنن. لەم دووەدا تەنیا (لێچوو – غەم) هاتووە، (لەوچوو – مرۆڤ) نەهاتووە.

**ب. جۆرە سەرەکییەکانی خواستن:**

خواستن لە رووی دەرکەوتنی یەکێ لە دوو بنەڕەتە بنچینەییەکەوە دەکرێت بە دوو جۆر:

١- خواستنی ئاشکرا: ئەو خواستنەیەکە لە دوو بنەڕەتە بنچینەییەکەی لێکچواندن تەنیا (لەوچوو) هاتبێت و (لێچوو) فڕێ درا بێت.

نموونە:

**هەرچەند گوڵ سیس ئەبێ بگرین**

**ئاڵتوونی دار ئەڕژێ بگریـــــن**

(گۆران)

خواستن لە وشەی (ئاڵتون) دایە. لەبەر وشەی (دار) دەزانین مەبەست لە وشەی (ئاڵتوون) ئاڵتوونی ڕاستەقینە نییە، بەڵکو گەڵای زەردە. واتە گۆران گەڵای زەردی بە ئاڵتوون چواندووە: گەلای زەرد (لێچووە) ئاڵتوون (لەوچووە). لەم دووە (لێچوو- گەڵای زەرد) فڕێ دراوە و تەنیا (لەوچوو - ئاڵتوون) باس کراوە. ئەم جۆرە خواستنە، کە (لەوچوو) هاتبێ و (لێچوو) فڕێدرابێ پێی دەگوترێ (خواستنی ئاشکرا).

٢- خواستنی درکاو:

**تا نەگریا ئاسمان و تەم وڵاتی دانەگـــــرت**

**گوڵ چەمەن ئارا نەبوو، هەم لێوی غونچە وا نەبوو**

(نالی)

(چەمەن ئارا: ڕازێنەرەوەی چەمەن، وانەبوو: نەکرایەوە)

لە نیوەی یەکەمدا خواستن لە (تا نەگریا ئاسمان) دایە. لەبەر وشەی نەگریا (نەگریا) دەزانین (ئاسمان) بە (مرۆڤ) چوێنراوە. ئاسمان (لێچووە)، مرۆڤ

(لەوچووە). لێرەدا تەنیا (لێچوو — ئاسمان) هاتووە و (لەوچوو — مرۆڤ) فڕێ دراوە، ئەوەندە هەیە (گریان)ی مرۆڤ دراوە بە ئاسمان کە نیشانەی خواستنەکەیە.

لە نیوەی دووەمدا، خواستن لە (لێوی غونچە وانەبوو) دایە لەبەر وشەی (لێو) دەزانین (غونچە) بە (مرۆڤ چوێنراوە). غونچە (لێچووە). لێرەدا تەنیا (لێچوو — غونچە) هاتووەو (لەوچوو — مرۆڤ) نەهاتووە. (لێو) نیشانەی خواستنە.

ئەم جۆرە خواستنە کە (لێچوو) بگوترێ و (لەوچوو) فڕێ بدرێ پێی دەگوترێ (خواستنی درکاو).

## پرسیار

لەم دێڕە شیعرانەدا خواستن دەربێنەو بنچینەکەی ڕوون بکەوەو جۆرەکەی دیاری بکە:

**١- لایدا سەرپۆش و پەرچەمی بای شەماڵ**
**مانگێك هاتە دەر پڕ لەخەت و خـــاڵ!!**

(حەمدی)

**٢- شێر لەبێشە دەرپەڕی دەست بەخەنجەر**
**ڕوو بەڕوو ئەیدا لە زومرەی دوژمنـــــان**

(سالم)

**٣- ئەو هەردوو نیهاڵ عەرعەرا شەنگ**
**روو نیشتنی میساڵ غونچە دڵتەنگ**

(خانی)

**٤- ڕۆژتە ئەی بادی نەورۆزی لەبنی بەفری گـــــران**
**کانی پێی سڕ بوو، چناریش دەستی چوو، پەنجەی تەزی**

(حاجی)

**٥- ئەڵێن ساڵ دوانزە مانگە**
**من مانگم دی چواردە ســـاڵە**

(پیرەمێرد)

**٦- چاوەکەم ئەمڕۆ لەگوڵشەن گوڵ بەعیشوە خۆی نـــواند**
**نەك نمەك گیربم بە مەرگی تۆ قەسەم هیچ نەمدواند**

(حەریق)

# ڕەگەزدۆزی

**ئـ– پێناسـەی ڕەگـەزدۆزی:** ڕەگـەزدۆزی ئەوەیـە دوو وشـە یـان زیـاتر لـە شێوەدا، واتە لە دەنگەکان وەکو یەك وا بن یـان لەیەکـەوە نزیـك بـن، بـەڵام مانایان جیا بێ. ئەگەر یەك مانایان هەبێ ڕەگەزدۆزی دروست نابێت.

نموونە:

**ئەگەر خاڵت بڵێم مشکی خەتای**

**عەزیز من ئەمەم عەینی خەتایە**

(حاجی)

لە کۆتایی هەردوو نیوە دێڕدا، وشەی (خەتا) هاتووە، هەردوو وشەکە لە شـکڵدا یـەك شـتن بـەڵام لـە مانـادا جیـان. یەکـەمیان (خـەتا) شـوێنێکە لـە تورکستانی چین، کەچی دووەم بەمانای گوناه و تاوان هاتووە.

نموونەیەکی تر:

**بە ئاه و گریان دیسان هاتەوە هەوری نیسان**

**جگەر پڕئاو و ئاور وەك عاشقی بێ قـــــەرار**

(وەفایی)

لەم دێڕەدا ڕەگەزدۆزی لە وشەکانی (ئـاو) و (ئـاور – ئـاگر) دایـە. ئـەم دوو وشەیە هەر چـەندە لـە شـکڵدا کـت ومـت وەکـوو یـەك نـین بـەڵام لەیـەك نزیکن. جیاوازییان تەنیا ئەوەیە کە وشەی (ئاور) یەك دەنگ (ر)ی کۆتایی لە وشەی (ئاو) زیاترە.

**ب- جۆرە سەرەکییەکانی ڕەگەزدۆزی:** ڕەگەزدۆزی دوو جۆری سەرەکی هەیە کە ئەمانەن:

ڕەگەزدۆزی تەواو و ڕەگەزدۆزی ناتەواو.

**١- ڕەگەزدۆزی تەواو:**

ئەوەیە ئەو وشانەی ڕەگەزدۆزی دەیانگرێتەوە، لە شکڵدا کت و مت و بێ جیاوازی وەکو یەك وابن. واتە لەم خاڵانەی خوارەوە وەکوو یەك بن:

- ژمارەی دەنگەکان
- جۆری دەنگەکان
- ڕیزی دەنگەکان

نموونە:

**ئەوەی ڕێگەی لەکوردەکان گۆڕی**
**لەعنەتی خوا لە ئەلحەدو گۆڕی**

(مەلای گەورە)

رەگەز دۆزی تەواو لەنێوان وشەی(گۆڕی) ی کۆتایی نیوەی یەکەم و (گۆڕی)کۆتایی نیوەی دووەمدایە، ئەم دوو وشەیە روخساریان وەکوو یەك وایە، بەڵام مانایان جیاوازە؟ یەکەمیان واتە ڕێگە لێ گۆڕین کە کارە، بەڵام دووەمیان ناوە واتە(قەبر).....

٢- ڕەگەزدۆزی ناتەواو:

ئەوەیە ئەو وشانەی ڕەگەزدۆزی دەیانگرێتەوە لەشکلدا کت و مت وەکو یەك نەبن، جیاوازییان هەبێ بەڵام لەیەکەوە نزیك بن.

جیاوازییەکە دەبێ تەنیا لە یەکێ لەم خاڵانە بێت:

- ژمارەی دەنگەکان
- جۆری دەنگەکان
- ڕیزی دەنگەکان

بۆی هەیە وشەکان لە ژمارەی دەنگەکانەوە جیاوازبن، واتە یەکێ لە وشەکان دەنگێك یان ئەگەر وشەکە درێژ بوو، دوو دەنگ لەوەی دی زیاتر بێ. زیادەکەش لەواتە لە سەرەتا یان لە ناوەڕاست، یان لە کۆتایی وشەکە هاتبێت. نموونە:

**مەعشووق تویی ب فەخر و نازی**

**عاشق تویی لێك بێ نیـــــازی**

(خانی)

ڕەگەزدۆزی لە وشەکانی (ناز) و (نیاز) دایە، دووەمیان (نیاز) یەك دەنگ (یـ) لە یەکەمیان (ناز) زیاترە و دەنگە زیادەکە کەوتۆتە ناوەڕاستی وشەکەوە (ـ یـ ـ).

- یان وادەبێ وشەکان لە جۆری دەنگێك جیاوازبن، جا ئەو دەنگەی گۆڕاوە چ لە سەرەتا، یان لە ناوەڕاست، یان لە کۆتایی بێ.

نموونە:

**پیری بە تەنیا ڕەحمەتە**

**پیری و هەژاری زەحمەتە** (حەمدی)

